

# گەشەسەندنی فیقهی ئیسلامیی

نووسینی:
د. سەباح بەرزنجی

وەرگێڕانی:
ئەڵوەنی حسێنی



پەیمانگای جیهانیی
فیکری ئیسلامیی ٢٢



سەنتەری زەهاوی
بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، وەك دامەزراوەیەکی پەیوەندیدار بە باسێکی زانستیی و مەعریفیی وەکو زانستی ئسولْ و فیقهی ئیسلامیی، لە میانەی ئەو کتێبانەی بڵاوی کردوونەتەوە، پانتاییەکی بەرچاوی بۆ باس و بابەتەکانی تایبەت بە زانستی فیقهی ئیسلامیی و مەبەستەکانی شەریعەت تەرخان کردووە.

ئەم کتێبەی بەردەست ئێوەی خوێنەریش هەر لەو چوارچێوەدا دێت. کتێبەکە لە بنەڕەتدا بەشی یەکەمە لە سێ بەشی تێزی دکتۆرای بەڕێز دکتۆر سەباح بەرزنجی لەبواری ئسوڵی فیقهدا، کە بەناونیشانی ((بزاڤی فیقهی ئیسلامیی لە گوزەری مێژوودا)) و بە زمانی فارسی نووسیویەتی و خاتوو ئەڵوەنی حسێنی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی، خوا یار بێت لە ئایندەدا هەردوو بەشەکەی تریشی بە چاپ دەگەیەنین.

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
بەشی چاپ و بڵاوکردنەوە

گەشەسەندنی
فیقهی ئیسلامیی

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
(٢٢)

# گەشەسەندنی فیقهی ئیسلامی

نووسینی:
د. سەباح بەرزنجی
وەرگێڕانی:
ئەڵوەنی حسێنی

چاپی یەکەم
١٤٣٤ ك ٢٠١٣ ز





ناوی کتێب: گەشەسەندنی فیقهی ئیسلامی.

نووسینی: د. سەباح بەرزنجی.

وەرگێڕانی: ئەڵوەنی حسێنی.

لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامی و

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، ژمارە (٢٢).

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٢٦٦)ی ساڵی (٢٠١٣)ی دراوەتێ.

چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١٣.

چاپخانە: شڤان.

تیراژ: (١٠٠٠) دانە.

ئیمەیلی پەیمانگا: iiitkurdistan@yahoo.com

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری مەزن، درووود لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەری سەروەرمان (دروودی خوای لێبێت)، هەروەها لەسەر خانەوادە و یارانی و هەموو شوێنکەوتووانی هەتا رۆژی دوایی.. ئامین.

فیقهی ئیسلامی وەکو یەکێك لە زانستە شەرعییە پڕبایەخەکان، لە زۆرینەی سەردەم و ساتەکانی مێژووی مسوڵمانان و قۆناغەکانی فەرمانڕەواییان و ژیانی تایبەتی هەر تاکێکی مسوڵماندا، رۆڵی گەورە و ئیجتیهادیی بینیوە، چەندین رۆڵ و قۆناغی بە پێی سروشت و پێویستییەکانی کات و شوێنەکان بڕیوە و تیایاندا سەرکەوتووانە بە سەر گرێ و گۆڵ و کێشەکانی رۆژگاردا زاڵ بووە. لە هەردوو رووی فۆرم و نێوەرۆکەوە، توانای نوێبوونەوە و سەرلەنوێ رێکخستنەوەی ژیانی کەس و کۆمەڵگەکانی بە شێوازێکی سەردەمی و هاوچەرخانە هەبووە. میللەتانی مسوڵمانی لە گێژاوی نەفامی و دواکەوتوویی دەرباز کردووە.

دوای ئەوەی تێگەیشتن و پەیڕەوکردنی ئەم زانستە گرنگە لە سەردەمە نزیکەکانی پێشوودا رووی لە پاشەکشە کرد و دەروازەکانی ئیجتیهاد بەرتەسك کرانەوە و رۆڵی بەرەو کەمبوونەوە چوو، تا گەیشتە ئەوەی گوتاری فیقهیمان بە گوتارێکی کلاسیکی و کۆن بناسرێتەوە، هەنووکە زانایان دەرکیان بە زەرووڕەتی تێهەڵچوونەوەی هەوڵە فیقهییەکان کردووە، بۆ زیاتر چەسپاندنەوە و کارپێکردنی لە واقیعی مسوڵماناندا.

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، وەك دامەزراوەیەکی پەیوەندیدار بە وەها باسێکی زانستی و مەعریفییەوە، لە میانەی ئەو زنجیرە کۆڕ و خول و سیمینارانەی تا ئێستا بە مەبەستی پەرەپێدانی توانای فیکریی و ئیجتیهادیی سازی کردوون، هەروەها ئەو کتێبانەشی بڵاوی کردوونەتەوە، پانتاییەکی بەرچاوی بۆ باس و بابەتەکانی تایبەت بە زانستی فیقهی ئیسلامی و مەبەستەکانی شەریعەت تەرخان کردووە. ئەم کتێبەی بەردەستی ئێوەی خوێنەریش هەر لەو چوارچێوەیەدا دێت.

کتێبەکە لە بنەڕەتدا بەشی یەکەمە لە سێ بەشی تێزی دکتۆرای بەڕێز دکتۆر سەباح بەرزنجی لە بواری ئسوڵی فیقهدا، کە بە ناونیشانی (بزاڤی فیقهی ئیسلامی لە گوزەری مێژوودا) و بە زمانی فارسی نووسیویەتی و خاتوو ئەڵوەنی حسێنی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی، خوا یار بێت لە ئایندەدا هەردوو بەشەکەی تریشی بە چاپ دەگەیەنین. بە هیوای ئەوەی ئەم بەرهەمە نوێیەش ببێتە مایەی سوود و هەوڵێکی تر بێت بۆ زیاتر ناساندنی زانستی فیقهی ئیسلامی و شارەزاکردنی خوێنەرانی بە پێناسە و بەش و رۆڵ و کاریگەرییەکانی.

**سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی**
**بەشی چاپ و بڵاوکردنەوە**
**٢٤/ی ڕەبیعی یەکەمی/١٤٣٤ی کۆچی**
**٢٠١٣/٢/٥ی زایینیی**
**سلێمانی**

# چەمکی فیقه

## ١-٢-١ فیقه لە زمانەوانییدا:

واژەی فیقه لە زمانەوانیدا، چاوگی کرداری (فَقِهَ یَفْقَهُ)، یان (فَقُهَ یَفْقُهُ)، یان (فَقَهَ یَفْقُهُ)ە، کە بە واتای تێگەشتن و ناسینە، (فیروز ئابادی) دەڵێت: (الفقه بالکسر العلم بالشيء والفهم له والفطنة) [1] فیقه بە هەبوونی کەسرە ( ِ) لەژێر پیتی (ف)کەیدا، هەمان زانیارییە بەو شتەی کە هەیە و تێگەشتن لێی و ئاگابوونە پێی. بە وتەی (راغیبی ئەسفەهانی) (هو التوصل الی علم غائب بعلم شاهد)[2]، واتا فیقه گەیشتنە بە زانیاریی نادیار بە هۆی زانیاریی بینراوەوە. بەڵام (ابن القیم) باوەڕی وەهایە فیقه تایبەتترە لە تێگەشتن، چونکە فیقه بە واتای تێگەشتنە لە مەبەستی بێژەر، ئەندازەیەك زیاتر لە ناسینی زمانەوانی.

لە قورئانی پیرۆزدا فیقه بەڵگەیە لەسەر تێگەیشتنی وردبینانە، بۆ نموونە خوای گەورە لە زمانی مووساوە دەفەرموێت: (وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي * يَفْقَهُوا قَوْلِي).[3]

خوایە گیان گرێی زمانم بکەرەوە تاکو ئەوان بە باشی لە قسەکانم بگەن. هەروەها دەفەرموێت (فَمَا لِهَـؤُلاء الْقَوْمِ لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثاً)[4] واتا ئەوان چییان لێ بەسەرهاتووە نزیك بەوەی کە هیچ قسەیەك بە باشی تێناگەن.

---

١- فیروز آبادی، القاموس المحیط، مادة فقه، ص١٠٠٧.

٢- راغب اصفهانی، مفردات القران، ص٣٨٤.

٣- سورة طه ٢٧-٢٨.

٤- سورة نساء، ٧٨.

## ١-٢-٢ چەمکی فیقھ لە سەرەتادا:

بە تێڕوانین لە بەکارهێنانە قورئانی و نەریتە باوەکانی سەدەکانی یەکەم و دووەمی کۆچی، فیقھ رەهەندی فراوانی هەبوو. بەڵگە بوو بۆ هەموو ئەو ئەحکامانەی سەبارەت بە (بیروباوەڕ، ئەخلاق، کردار، خواپەرستی، مامەڵەکردن) هەن.

(تَفَقُّهْ) لە ئایندا کە هاومانای ئایینناسییە، یەکێکە لە فەرزە کیفایەکانی کۆمەڵگای ئیسلامی. هەر لەم بارەوە بووە (ئەبو حەنیفە) بونیادەکانی دینی بە (فقه أكبر) ناوناوە، لە جێگایەکی تردا فیقهی بە ناسینی ماف و فەرزەکانی نەفس ناساندووە[1].

لە سەرەتاکانی کۆکردنەوەی سوننەتدا، زانست (علم) یان وەك ناسینی حەدیسەکان و (فقه) یان وەك ناسینی واتاکانی قورئان ناوزەد کردووە. لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) بەم جۆرە نزای بۆ ئیبن عەباس کردووە: (اللهم فقهه في الدين وعلّمه التأويل).[2] پەروەردگارا ئەو ئاگا بکە لە دین و فێری زانینی هەموو ئایەتەکانی قورئانی بکە.

## ١-٢-٣- واتای فیقھ لە تێڕوانینی زانایانی زانستی ئوصولدا:

ئوصولییەکان بۆچوون دارییان بۆ فیقھ نەبووە وەك واتا بۆ ناوێك، بەڵکو گرنگییان بە واتا تاریفکراوەکەی داوە، واتە فیقهیان بەم شێوەیە پێناسە کردووە: (فیقھ ناسینی ئەحکامە شەرعییەکانە لە ڕێگای ئیجتهادەوە).

بەو جۆرەی کە شیرازی لە (لمع)[3] هێناویەتی.

---

١- نظام الدين عبدالحميد، مفهوم الفقه الاسلامی، ص١٢.

٢- امام احمد بن حنبل، المسند: مسند بنی هاشم، حديث رقم ٢٢٧٤.

٣- شرح اللمح ابواسحاق شيرازی، ج١، ص١٥٨.

یاخود فیقه (زانینی ئەحكامی شەرعییە لە ڕێگەی بەڵگەی تفصیلی (وردكراوە)) بە پێی گێڕانەوەی تەفتازانی لە هاوەڵانی شافعییەوە،[1] یان هاوڕا لەگەڵ (ئامیدی) (شارەزابوونە لە ئەحكامە شەرعییە جوزئییەكان، كە لە ڕێگەی بۆچوون و بەڵگەوە بەدەستدێن).[2]

هەروەها (صدر الشريعة) هەوڵدەدات فیقه بە شێوازێك پێناسە بكات كە فیقهی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە زانستی فیقهدا جێگابكاتەوە. ئەو دەڵێت: (فیقه زانینی هەموو ئەو ئەحكامە شەرعییە كردارییانە دەگرێتەوە وا دیارە لە ڕێگای نیگاوە دابەزیون و شوێنی هاوڕابوون بووە. لەگەڵ لێهاتوویی هەڵگۆزینی ڕاست لێی).[3]

بە سەرنجدان لەم پێناسەیە، نەبوونی ئاگایی هاوەڵان لەو دەستە ئەحكامانەی كە بە دەستیان نەگەشتووە، ڕێگرە لە ناوزەدكردنی تاریفی فەقاهەت بەسەر ئەواندا، چونكە ئەو ئەحكامانەش لەگەڵ گەیشتنی پێیان وەریان دەگرت.[4]

بە سەرنجدان لەو پێناسانەی كە باس كران، دەكرێت بەم ئەنجامانەی خوارەوە بگەین:

**یەكەم:** زانینی ئەحكامە بیروباوەڕییەكانی وەك زانینی ئەفراندن، دروستبوونی جیهان (حدوث)، پێویستبوونی ڕۆژی دوایی، بە فیقه ناونانرێت، چونكە ئەم ئەحكامانە لە ڕێگەی ئاوەز و ئیمان بە پێغەمبەرایەتییەوە بەدەست دێن.

**دووەم:** زانینی بابەتە هەستپێكراوە ئەزموونییەكان، بە فیقه هەژمار ناكرێت، هەرچەندە لە جیاكردنەوە دەستنیشانكردنی سوودەكانی ئەحكامدا ڕۆڵی كاریگەری هەیە.

---

١ - التفتازانی، التلويح فی كشف حقائق التنقيح، ج١، ص١٢.

٢ - الآمدی، الحكام فی اصول الاحكام، ج١، ص٢٢.

٣- صدر الشريعة، التنقيح، ج١، ص١٧.

٤- نظام الدين عبد الحميد، مفهوم الفقه الاسلامی، ص١٢.

**سێهەم:** زانینی بنەماكانی زمان، وەكو (رفع فاعل ـ نصب مفعول) هەرچەندە لە پێویستییەكانی فەقاهەتن، بەڵام بە فیقهـ دانانرێن، چونكە ئەم ئەحكامانە بە (دانراو (وضعي)) ـ (اصطلاحي) دەستەواژەیی ناویان بردووە.

**چوارەم:** زانیاری لەسەر بەڵگەی كۆدەنگی و بەشەكانی، نەك بە فیقهـ دانانرێت، بەڵكو لە دەستەی مەسەلەكانی زانستی ئوصولە. لەبەرئەوە لە دەستەی ئەحكامی شەرعی و ناكردارییەكانە (تیۆری).

**پێنجەم:** زانستێك كە بە خۆ تەقلیدكردن لەسەر ئەحكامی شەرعیی كردارێك بە دەست دێت، ناچێتە نێو بازنەی فیقههەوە، چونكە ئەم زانستە نەك لە ڕێگەی بەڵگەوە، بەڵكو لە ڕێگەی تەقلیدكردن لە موجتەهیدێكەوە بە دەست دێت.

**شەشەم:** فیقهـ زانستێكە یەكلاكەرەوەی ڕووت بە بیروباوەڕی (ابن الهمام)، یا زانستێكە گومان هەڵگری ڕووت بەو جۆرەی كە شیرازی باوەڕی وەهایە، یاخود زانستێكە گشتیتر لەوەی یەكلاكەرەوە بێت یان گومان هەڵگر، بەو جۆرەی كە بۆچوونی زۆربەی زانایانی بواری ئوصولە، بەو بەڵگەیەی كە فیقهـ كۆمەڵێك ئەحكامە كە هەندێكیان بەڵگەی یەكلاكەرەوەیان هەیە و هەندێكیان بەڵگەی گومان هەڵگریان لەسەرە!

**حەوتەم:** زانست دەكرێت (كورتكراوە "مجمل") یا درێژكراوە (مفصل) یان (یەكلاكەرەوە–گومان هەڵگر)، (گشتی (عام) یا ـ هەندەكی ( جزئي)) بێت.

**هەشتەم:** بڕیاری شەرعی دەكرێت (تەكلیفی تێدا بێت– تەكلیفی تێدا نەبێت)، یان (جێبەجێ بكرێ ـ تنجیزی تعلیقي ـ دواخراو) (سەرەتایی ـ ناسەرەكی) (داكەوتە (واقیعی) ـ ڕواڵەتی) (عەقڵی یان ـ "گێڕاوە (نقلي)) بێت.

**نۆهەم:** ڕەفتار لەوانەیە كاری (گرووپ– تاك) (موسڵمان ـ غەیری موسڵمان) (سەردەست ـ ژێردەست) (حكومەت ـ هاووڵاتی) (كاتی ـ هەمیشەیی) بێت.

**دەهەم:** فیقهـ بەردەوام گرنگی بە ڕەفتاری مرۆڤ دەدات، واتا پەیوەندییەکی هەمیشەیی لەگەڵ داکەوتەی کۆمەڵگادا هەیە. هەر فەقیهێك پەیوەندیی بە داکەوتەیەکەوە هەیە و هەر داکەوتەیەك[1] پێویستی بە فەقیهێك هەیە.

**یازدەهەم:** مەبەست لە بەڵگەی (تفصیلي) (ئایەتەکانی قورئان– فەرمودە– (أقوال الصحابة) و هاوەڵانی، بەرهەمی زانایان و قیاساتی فەقیهەکان)ە. ئەم بەڵگەیە بە پێی پێوەرەکانی زانستی ئوصول هەڵدەسەنگێنرێن، بە پێی زانستە جیاوازەکان سوودی لێ وەردەگیرێت.

## ١–٢–٤ واتای فیقهـ لای فەقیهەکان:

فیقهـ بە بۆچوونی فەقیهەکان دوو واتا زیاتری نییە:

**یەکەمیان:** ئاگاداربوونی مرۆڤە لە هەندێك لە ئەحکامە شەرعییە کردارییەکان (عملي)، کە لە قورئان و حەدیسەکاندا هاتووە. بەو واتایە کە فیقهـ تایبەتمەند نییە بە (مجتهد)ەوە، چونکە جگە لە موجتەهیدەکان کەسانی تریش دەتوانن بە ژمارەیەك لەم مەسەلانە ئاگاداربن.

**دووهەمیان:** هەمان ئەو ئەحکامە شەرعییە کردارییانەیە کە بنەمای ڕەوابوونیان لە قورئان و سوننەتدا هاتووە.

فیقهـ بە زانستی فەرعەکان ناودەبرێت، لەو لایەنەوە کە زانستێکە لە بنەماکانی دینەوە وەرگیراوە، چونکە باوەڕبوون بە فیقهـ، فەرعی باوەڕبوونە بە بنەماکانی دین، یان بە هۆکاری ئەوەی کە ئەحکامی فیقهی لە ئەنجامی جێبەجێ کردنی بنەما فیقهییەکان بەسەر بابەتە جیاوازەکاندا بەدەستهاتووە.

---

١ - داکەوتە: واقیع

## ١-٢-٥ تایبەتمەندییەکانی فیقھ:

بەپێی بابەتە هێنراوەکان، فیقھ شتێکە جگە لە شەریعەت، واتا شەریعەت چوارچێوەی بەرەوپێشچوون و نوێبوونەوەیەتی. هۆکاری سەرهەڵدانی لە سەردەمی ئیسلامدا هەمان پێویستیی مرۆڤەکان بووە بە ناسینی ئەحکامی ڕووداوە نوێیەکان. ئەم هۆکارە لە هەموو قۆناغەکاندا و لەگەڵ هەر هەلومەرجێکدا دەمێنێتەوە هەر بەو شێوەیە. بەتایبەتی کە خەڵکی بەردەوام پێویستیان بە ڕێکخستنی کاروبارەکانیان و ناسینی مافەکان و ئەرکەکانیان دەبێت.

**بە سەرنجدان لەم بابەتانە، تایبەتمەندییەکانی فیقھ بریتیین لە:**

١ـ سرووشی خوایی بنەماکەیەتی: یەکەمین خاڵی جوداکردنەوەی لە یاسا مرۆییەکان ئەوەیە کە سەرچاوەکەی سرووشە (وحي)، واتا قورئان و حەدیسی پیرۆز. کەوایە هەر موجتەهیدێك ئەو ئەرکەی لەسەرە کە لە دەربڕینی (اجتهاد) و بۆچوونە نوێیەکانیدا ئاگاداری ئەم دوو بنەمایە بێت، پابەند بێت بە ڕۆحی شەریعەت و ئامانجی یاسا و بنەما گشتییەکانیەوە.

٢- پێویستییەکانی ژیان دەگرێتەوە: تایبەتمەندییەکی تری فیقھ ئەوەیە کە هەر سێ ڕەهەندی پەیوەندییەکانی مرۆڤ لەبەرچاو دەگرێت، واتا پەیوەندیی (مرۆڤ و خودا، مرۆڤ و خود، مرۆڤ و کۆمەڵگا)، چونکە فیقھ (دونیا و ڕۆژی دوایی، دین و دەسەڵات) لەخۆ دەگرێت و ئەحکامەکانی سەرمەدییەو ڕەهەندە جیاوازەکانی ژیان زیاتر لەمانە (بیروباوەڕ، خواپەرستی، ئەخلاق، کۆمەڵایەتی) ئاڕاستە دەکات. تا بەم هۆیەوە (بەئاگاهاتنەوەی ویژدان، هەستی بەرپرسیارێتی، ڕێزگرتن لە مافی خەڵکی، گرنگیدان بە چاودێریکردنی خوایی، ڕێکخستنی کاروبارە تایبەتی و گشتییەکانی مرۆڤ) بەدەست بێت.

بۆ بەدەستهێنانی ئەم ئامانجەیە کە ئەحکامی فیقهی بە تاریفی شەرعی لە خۆگری گشت کردارە مرۆییەکانە، گشتیتر لە (گوتار، کردار، گرێبەستەکان، دەستبەسەرداگرتنەکان) دەبێت، هەروەها بۆ دوو جۆری (خواپەرستییەکان و مامەڵەکان) دابەشبوون وەردەگرێت.

**یەکەم:** ئەحکامی خواپەرستی: وەکو نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات، نەزر، سوێند، کە مەبەستی سەرەکی لە دانانیان ڕێکخستنی پەیوەندیی رۆحیی نێوان مرۆڤە لەگەڵ خودادا، کە پەراوێزەکەی لە قورئانی پیرۆزدا نزیکەی ١٤٠ ئایەت دەبێت.

**دووەم:** ئەحکامەکانی مامەڵە کردن: گرێبەستەکان، سزاکان، دەستبەسەرداگرتن، تاوانەکان، کەفالەت ....هتد، کە بە مەبەستی ڕێکخستنی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لە لایەن کەسی زاناوە دانراوە و دابەش دەبێت بۆ ئەمانەی لای خوارەوە:

أ- باری کەسێتی: ئەمەش (مافی خێزان، بابەتەکانی هاوسەرگیری، تەڵاق، بژێوی، نەسەب، وەسیەت، میرات) لەخۆ دەگرێت، بە چاودێرییەکی تایبەت لەلایەن فەقیهەکانەوە وردکردنەوە و وردبینیی زۆر لەو بەشەدا ئەنجامدراوە، بە جۆرێك کە هەرکەس بەئاگابێت لە ڕاڤەکراوی و فراوانی و وردبینیی زۆر لەمەدا، سەرسام دەبێت بە مەزنیی فیقهی ئیسلامی.

ب ـ ئەحکامی شارستانی: کە لەگەڵ مامەڵەکردنی خەڵکی و ئاڵوگۆڕی ڕۆژانەیاندا لە پەیوەندیدا بووە و لەخۆگرتنی بابەتەکانی (فرۆشتن، ڕەهن، کەفالەت، قەرز، گرێبەستەکان) دەبێت، لە گشت قورئاندا نزیکەی ٣٠ ئایەت لەم بارەیەوە هەیە.

ج ـ ئەحکامی سزایی: لە پەراوێزی تاوانەکان و سزاکان کە بڕیاریان لەسەر دراوە، باس دەکات، مەبەست لە دانانی پاراستنی گیان، ماڵ و دارایی، کەرامەت و مافی خەڵکی و دەستەبەرکردنی ئاسایشی کەسی و کۆمەڵایەتییە. لە قورئاندا نزیکەی ٣٠ ئایەت هاتووە لەم بارەیەوە.

د- یاسای بنەڕەتی "دەستوور" (القانون الأساسي): ئەحکامێکە پەیوەست بە سیستەمی دەسەڵات و بنەماکانی، کە بە مەبەستی ناسینی پەیوەندیی دادوەر و تاوانبار، ئەرك و مافی تاك و گرووپەکان، لە لایەن کەسی شارەزاوە دانراوە.

و- یاسای نێونەتەوەیی: ئەو ئەحکامانەن کە پەیوەندیی نێوان حکومەتی ئیسلامی و حکومەتەکانی تر لە ماوەکانی جەنگ و ئاشتیدا، هەروەها پەیوەندیی نێوان حکومەتی

ئیسلامی و هاووڵاتیانی غەیری موسڵمان، دیاری دەکەن. مەبەست لێی ناسینی جۆری پەیوەندی و هاوکاری و ڕێزلێنانی بەرامبەرە لە نێوان وڵاتەکاندا.

ز- ئەحکامی ئابووری و دارایی: ئەو ئەحکامانەن کە ماف و گرێبەستە داراییەکانی تاکەکان، کاروباری ئابووریی حکومەت وەکو (خەزێنەداری، دەرامەتەکان) ڕێکدەخەن، پەیوەندیی دارایی نێوان سەرمایەداران و کەمدەرامەتەکان و حکومەت و هاووڵاتیان دیاری دەکات. لەم جۆرە بەشەدا لە فیقهـ، سەرانەی تایبەت و گشتیی حکومەت، واتا (دەسکەوتەکانی جەنگ، ئەنفال، سەرانە،ماڵیاتی زەوی، کان و کانزاکان، زەکات، نەزرەکان، خێرات، سوودەکانی بازرگانی، کۆمپانیا و سەرمایەگوزارییەکان، سزا ماڵییەکانی وەکو کەفارەت، فیدیە، خوێنبەها) دەخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

ح - ئەخلاق، دابونەریتە تاکی و کۆمەڵایەتییەکان: لە فیقهدا جگە لەمانە هەندێك ئەحکام هەیە کە ڕێگری دەکات لە کێشە و ئاژاوەنانەوەی تاکەکان و دەبێتە هاندەر بۆ بڵاوبوونەوەی فەزیلەتە ئەخلاقییەکان و هاوکاری و هاوڕێیەتیی نێوان تاکەکان.

شایانی باسە هۆکاری راستەقینەی ئەم فراوانی و گشتگرییەی فیقهـ، هەمان ڕۆچوون و گشتگیری و نەمریی دوو سەرچاوە ئەساسی و ڕەسەنەکەیەتی، واتا قورئان و سوننەت، بە جۆرێك کە هەموو گۆشە و ڕەهەندەکان، پێوستییەکانی ژیان دەخەنە ژێر تیشکی خۆیانەوە.

٣- پەیوەندیی نەپچڕاو لەگەڵ ئایندا: یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی فیقهـ پەیوەندیی بەردەوامیەتی لەگەڵ ئایندا، واتا بڕوابوون بە فیقهـ لە میانەی وەرگرتن و بڕوابوونە بە بنەما و بیروباوەڕی دین، لەبەرئەوە هەر کردار و ڕەفتارێك کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات، بیری حەڵاڵ یان حەرامبوون دەیگرێتەوە، بەتایبەت لە ئەحکامی مامەڵەکردندا کە هەر کردارێك بە دوو شێواز لە بڕیار تاریف کراوە:

**یەکەم** - بڕیاری دادوەریی (الحكم القضائي): تەنها سەیری ڕواڵەت و دەرکەوتەی ڕواڵەتی دەکات، لەلایەن دادوەرەوە دەردەچێت. هەڵبەت تا ئەو جێگەیەی کە دەتوانێت

دەچێتە لای بڕیارەکە و لەسەر ئەوەی کە باش و دادپەروەرانەیە، دادوەری دەکات، ئەم دادوەرییە حەڵاڵ حەرام و حەرام حەڵاڵ ناکات.

**دووەم** ـ بڕیاری ئاینی (الحكم الديني): کە بە نیەت و مەبەستی لایەنی ڕۆژی دوایی کردارەکەوە پەیوەستە. داکەوتەی ڕووداوەکەی لە بۆچووندایە و لەلایەن موفتییەوە ئاشکرا دەکرێت. پێودانگەکانی کێشەکە لەم حاڵەدا لێدوان لە بڕیاری شەرعیی کردارەکە بووە و هیچ گوێڕایەڵبوونێکی تێدا نییە (ئیلزامیبوون).

بەرهەمی ئەم جیاوازییە لە نێوان بڕیاری دادوەری و بڕیاری دیانەتیدا لە بەشە جیاوازەکانی وەکو (تەڵاق، سوێند، قەرز، (إكراه، زۆرلێکردن)دا دەردەکەوێت، هەر لەبەر ئەوەیە کە ئەرکی موفتی ئەرکی دادوەر جیایە، چونکە دادوەر بڕیارەکانی بەسەر بنەمای ڕواڵەتی ڕووداوەکە دادەنێ و سەرئەنجام بڕیارەکانی لەسەر بنەمای بەڵگە و هۆکارە ڕواڵەتییەکان دیاری دەکات، سەرئەنجام بڕیارەکەی پێویست دەبێت.

بەڵام موفتی گرنگی بە هەردوو لایەنی ڕواڵەتی و دەروونی دەدات. تا ئەو جێگای بتوانێت بڕیارەکەی لەسەر ئەساسی داکەوتە دەردەبڕێت.

کەوایە لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە لە فیقهدا یاسا و پرۆگرامەکانی لەلایەن ئاینی ڕووت و ناوەوەی مرۆڤەکانیش گرنگی پێدەدات.

٤ـ گونجان و نەمریی: یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی فیقه گونجان و نەمر بوونە، واتا سروشتێکی وەستاو و چەقبەستووی نییە، بەڵکو هەماهەنگ لەگەڵ گۆڕانکارییە جیاوازەکانی ژیان بەرەو پێش دەڕوات، وەڵامدەرەوەی پێویستییەکانی ڕۆژانەی خەڵکییە، بەو هۆیەوە کە فیقه دەرکەوتنێکە لە دەرکەوتنەکانی ڕاڤە و تەئویلی شەریعەت و خاڵی کرداری و جێبەجێکردنی بنەما و بونیادەکەیەتی، هەروەها شەریعەت حەقیقەتێکی نەمر و زیاترە لە وتەزاکانی کات و شوێن، چونکە شەریعەت بە ناونیشانی بنەما و سەرچاوە لە تایبەتمەندیی نەمریبوون، گشتگیری و گشتی بوون پشکی هەیە، لەبەرئەوە دەبێت جێبەجێکردن و هێنانەدی لە ماوەی کات و شوێندا ئەم جۆرە تایبەتمەندییە لەخۆ بگرێت، بەو جیاوازییەی کە شەریعەت جێگیر، گشتی و پیرۆزە،

بەڵام فیقهـ گۆڕاو، مرۆیی و تا ئەندازەیەك جوزئی و مێژووییە. لە قۆناغە جیاوازەکاندا لەگەڵ زمانناسیی نوێدا بە یەك دەگەن. بەڵگەی زۆر لەم بارەوە لەبەردەستدایە کە فیقهـ هەڵبژاردنی جۆراوجۆری بۆ هەر مرۆڤێك تایبەت بە هەرشتێك و هەر کارێکەوە، دەخاتەڕوو.

٥- دوولایەنە بوونی ئەرکەکانی: فیقهـ زانستێکە هەم کەرەستەیی (آلي)، هەم ئامانجی (غائي)یە. زانستێکە (آلي)، کە بە هۆی ئەوەوە دەگەینە مەبەست و ئامانجێك، زانستێکە (غائي)، کە بۆ خوێندنی پێویستمان بە زانستەکان و زانیارییەکان هەیە. بە دەربڕینێکی تر، فیقهـ لە ژیانی مرۆڤدا دوو ئەرکی گەورەی هەیە:

١- ئەو ڕێنمایی دەکات بۆ لای ئامانج و شوێنێکی تایبەت.

٢- ئەو بانگهێشت دەکات بۆ فێربوونی زانست و زانیارییە جۆراوجۆرەکان - بە ئاراستەی گەیشتن بەو ئامانج و مەبەستانەی کە لەسەر بنەمای فیقهـ دانراون.

٦- فیقهـ زانستێکی ئەخلاقگەرایە: فیقهـ زانستێکە کە لەژێر کاریگەریی بەها ئەخلاقییەکاندا و بە پێچەوانەی یاسا مرۆڤکردەکان، کە جگە لە بەرقەرارکردنی ئاسایش لە کۆمەڵگادا هیچ مەبەستێکی نییە. هەرچەندە هەندێك بنەما و بونیادی دینی و ئەخلاقی پێشێل بکرێت.

فیقهـ زانستێکە لە بناغەدا بەرهەمێکی جگە لە دابینکردنی فەزیلەت و بەهای بەرزی ئەخلاقیی پەسەندکراو نییە، بۆ نموونە خوداپەرستی هۆکارێکە بۆ پاکبوونەوەی ڕۆحی مرۆڤ، بەخشینی ئارامی پێی و دوورکەوتنەوەی لە خراپە و پاراستنی لێی، حەرامکردنی ئەو مامەڵانەیە کە ڕیایان تێدایە و دەبێتە هۆی ئەوەی هاوکاریی نێوان تاکەکان زیاتر بێت. نیازمەندان پشتیوانی بکرێن لە بەرامبەر کینە و رقی کەسانی دەسەڵاتداردا، فێڵ و درۆکردن لە گرێبەستەکاندا نەمێنێت. کەوایە ئەگەر فیقهـ و ئەخلاق یەکبگرن، هەم کۆمەڵگا و هەم تاکەکانیش دێنە سەر ڕێگای ڕاست و بەختەوەر دەبن لە دونیا و ئاخیرەتدا.

٧ـ سزاكان هەم دونیایین هەم ئاخیرەتی: هەروەك دەزانین لە یاسا مرۆییەكاندا سزاكان تەنها لایەنی ئەم جیهانە ماددییە ڕەچاو دەكەن و هیچ گرنگییەك بە سزاكان لە جیهانەكەی تر (ڕۆژی دوایی) نادرێت. چونكە بنەمای ئەم یاسایانە بیروباوەڕێكی لائیكە كە بێموبالاتە بە ژیانی پاش مردن. زۆرتر چاو دەخاتە سەر لایەنە ڕواڵەتییەكانی ئەو سەرپێچییانە، هیچ گرنگییەك نادات بە سەرپێچییە قەلبییەكان (پەیوەندییان بە دڵەوە هەیە)، وەك كینە و حەسودی، لەكاتێكدا فیقه هەم سزا دونیاییەكان جێگیر دەكات، هەمیش گرنگی بە سزاكانی ڕۆژیی دوایی دەدات.

لەلایەكی ترەوە یاسا تەنها بە كارە سەرپێچییەكان پەرچەكردار پیشان دەدات و سزای بۆ دادەنێت، بەڵام سەبارەت بە كارە چاك و هاوڕاكان بێ مەیلەو هیچ پاداشتێك بۆ تاكە باش و چاكەكارەكان لەبەرچاو ناگرێت، بە پێچەوانەی فیقه، كە سەبارەت بە كارە چاكەكان و تاكی چاكەكار بێ مەیل نییە، وە بۆیان پاداشتی دونیایی و ڕۆژی دوایی قایلە.

٨ـ فیقه زانستێكی گشتگەرا و كۆمەڵایەتییە: مەبەستی ئێمە لەم تایبەتمەندییە جێگیركردنی ئەو ڕاستییەیە كە لایەنخوازیی فیقه تەنها لە ڕەچاوكردنی سوودەكانی تاكدا ناهێڵرێتەوە، تەنها بە دابینكردنی سوودەكانی تاك قایل نابێت، بەڵكو سەروتر لە سوودەكانی تاك، گرنگی بە بەئەنجامگەیاندنی بەرژەوەندییە ڕاستەقینەكانی كۆمەڵگە دەدات، لەبەر ئەوە لە نێوان تاك و كۆمەڵگادا هاوسەنگی ڕادەگرێت بەبێ ئەوەی یەكێكیان بە باشتر بزانێت لەویان، یاخود مافی یەكێكیان لەبەر ئەویتریان لەبەرچاو نەگیرێت. بەڵام لەكاتی هەبوونی دژایەتیی بەرژەوەندیی تاك لەگەڵ بەرژەوەندی كۆمەڵگا، وەكو پێویست بەرژەوەندییەكانی كۆمەڵگا ڕەچاو دەكرێت. چونكە بەرژەوەندیی كۆمەڵگا بەرژەوەندیی خەڵكێكی زۆر لەخۆ دەگرێت.

لە فیقهدا ئەگەر هەندێك خواپەرستی بە شێوازی كۆمەڵ و هۆكاری ئامانج دانان، زۆرتری ئەحكامی ڕوولێنراو بەهێزكردنی باری دەروونیی گشتییە، هەمیشە یاسا و ڕێكخستنێك كە بۆ ژیانی تاك و كۆمەڵگا دەكێشێت، لەبەر لایەنخوازیی

کۆمەڵایەتییەکەیەتی. بۆ شرۆڤەی ئەم تایبەتمەندییە دەتوانین ئاماژە بەم نموونانەی خوارەوە بکەین:

١- دانانی پێنج فەرزە.

٢- حەڵاڵبوونی فرۆشتن و حەرامبوونی ڕیبا.

٣- قەدەغەکردنی شاردنەوەی شمەك و دیاریکردنی نرخ.

٤- دانانی سزای تایبەت بۆ هەندێ تاوان.

٥- ڕێکخستنی یاسای خێزان.

٦- پاراستنی مافی دراوسێ.

٧- فرۆشتنی ناچاری لەپێناوی بەرژەوەندیی گشتیدا، بۆ دروستکردنی مزگەوت و قوتابخانە.

٨- پێنەدانی سەرزەوییە ڕزگارکراوەکان بە رزگارکەران، هێشتنەوەی ئەوانە لە دەستی خاوەنەکانی خۆیاندا لە بەرامبەر پێدانی سەرانە و خەراج، لەبەر کۆکردنەوەی سەرمایەی حکومەت و ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییە گشتییەکانی موسڵمانان.

هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی خوای گەورە شەریعەتی لەسەر بنەمای ئامانجی حەکیمانە، کە بەرژەوەندیی تاك و کۆمەڵگای تێدایە، داناوە.

٩- فیقه زانستێکە ڕەسەن و هەڵگری پەیامی نوێخوازییە: هەر زانستێك لە ئەنجامی کردار و پەرچەکرداری دوو سیستەم، کامڵبوون لەخۆ دەگرێت. واتا سیستەمێکی نەگۆڕ کە لە بنەما و بونیادەکانی پێکدێت و سیستەمێکی گۆڕاو کە لەخۆگری وەڵامە نوێبووەوەکانی ئەو زانستەیە بە پرسیارەکانی ڕۆژ، بەم بەڵگەیە فیقهی ئیسلامی بە ناونیشانی زانستێکی تایبەت تاریف کراو بە تاریفی جێگیری، لەخۆگری تایبەتمەندیی نوێبوونەوە، بەرەوپێشچوون و ڕەسەن بوونی فیقه، سەرهەڵداوی پێکهاتەی نەگۆڕییە، واتا سەرهەڵداوی بونیاد و بنەما و نوێبوونەوەیەتی، کە ئەویش لەدایکبووی پێکهاتەی کات و شوێنە، (شوێن کات).

کەوایە فیقهی ئیسلامی فیقهێکی پایەدار، گۆڕاو، پێشکەوتوو، کامڵبوو، لەگەڵ نەگۆڕیی ماهییەتی مرۆڤدا، کەسایەتیی ئەو، پێویستییەکان، پرسیار و داواکار، چاوەڕوانییەکانی ئەو نوێبووەوەیە، نوێخواز و هاوڕا گونجاو لەگەڵ کات و شوێندا.

١٠ـ فیقه زانستێکە چڕبووەوە، هەڵگۆزراو، بەرهەمهێنراو: فیقهی ئیسلامی زانستێکە کۆکراوە، هەڵگۆزراو، بەرهەمهێنەر، چڕبووەوە لەو لایەنەوە کە بە تێپەڕبوونی کات ئەحکام و فتواو بابەتەکان زیاد دەبێت، بەپێی جۆراوجۆربوونی کۆمەڵگاکان پێشەنگاکان و چەسپاندنی یاساکانی گۆڕانی بەسەردا دێت، بە جۆرێك کە ئەحکامی هیچ کات و شوێنێك ئەحکامی کات و شوێنەکانی تر نەرێنی لێ ناکات.

زانستێکە هەڵگۆزراو، بەرهەمهینراو، بەو واتایە کە ئەحکامی فیقهی بە پەیوەندیی دین لەگەڵ داکەوتە و شەریعەت لەگەڵ ژیاندا، دروست دەبێت. فیقه کاتێك ڕووناکی دەبینێت کە ئاین هاتبێتە خوارەوە لە ئاسمان و جلوبەرگی ڕاستەقینەیی لەبەرکردبێت و لە ڕەفتاری مرۆڤەکاندا دەربکەوێت، بەم جۆرە فیقه دەرکەوتن و توانەوەی دینە لە جەستەی ژیاندا.

١١ـ فیقه بنەمای هەر جۆرە نوێخوازی و چاکسازییەکی ئیسلامییە: فیقهی ئیسلامی شێوازی ژیانی کرداریی تاك و کۆمەڵگای موسڵمانان دەبێت، لەم لایەنەوەیە بە هێڵی پێشەوەی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هێرشی کولتووری ڕۆژئاوا ناوزەد دەکرێت. ئا لەم خاڵەوەیە کە هەر جۆرە نوێبوونەوە، یاخود چاکسازییەك لە نێو کۆمەڵگای ئیسلامیدا، دەبێت لە فیقه و بنەماکانیەوە دەستپێبکات، چونکە بە بۆچوونی ڕیفۆرمخوازان، فیقه نمایشکاری ئیسلامێکی مێژووییە. هەر جۆرە گەڕانەوەیەك بۆ سەردەمی ئیسلام بەبێ ئاشنایی لەگەڵ فیقه و بەبێ نوێبوونەوە تێیدا، ناگونجێ، بەتایبەت کە ئەوانەی هەوڵدەدەن لە ڕێگەی نوێکردنەوە لە پێکهاتەی ڕۆح و بابەتەکانی فیقهدا سیستەمێکی

کاملْ و تەواوکراو بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی دابڕێژن. کە هەڵبەت ئەم کارە بەبێ چاوپێداگێڕانەوەی فیقه و ڕێڕەوی مێژوویی ئەو، ناکرێت.[1]

١٢ـ فیقهی جێگیر و فیقهی ناجێگیر: فیقه زانستێکە بە دوو لایەنی گۆڕاو و نەگۆڕ، چونکە ئەحکامی شەرعی دوو جۆرن:

١ـ ئەحکامی جێگیر، بونیادەکانی سەرەکیی شەریعەتە و گۆڕان لەخۆ ناگرێت.

٢ـ ئەحکامی ناجێگیر، بریتییە لە هێڵەکانی درێژایی یاسا (گۆڕانی بەسەردا دێت).[2]

لایەنی جێگیری فیقه بە لایەنی مرۆیی، لێهاتوویی، کۆمەڵایەتی، دەروونی، جەستەیی و ئایدۆلۆژیاکانی مرۆڤەوە پەیوەستە. (حلال محمد حلال الی یوم القیامة وحرام محمد حرام الی یوم القیامة)، بەڵام لایەنی ناجێگیر دەکەوێتە ژێر کاریگەریی کات و شوێنەوە.

کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە ژیانی سەرەتاییەوە بە جۆرێکی تر لە بیابانەوە بۆ گوند، لە گوندەوە بۆ شار تێپەڕیوە، وەك هەمیشەش شێوازی ژیان بە درێژایی مێژوو لە بەرز و نزمیدا بووە و دەبێت، ئاساییە کە فیقه ئەم تایبەتمەندییانەی لەبەرچاو گرتووە، تاکو هاوڕا لەگەڵیدا پێ بخاتە نێو مەیدانی بوونەوە.

١٣ـ فیقه لە سروشتدا زانستێکی پایەدارە: بنەمای پێشکەوتن و بزوتن، یەکێکە لە بنەماکانی بونیادی فیقهی ئیسلامی، بە جۆرێك کە دەتوانرێت بزاوتن وەك گیانێکی هەمیشەیی ئەو لەبەرچاو بگیرێت، لەبەر ئەوەی بە درێژایی مێژوو چاولێکەری گۆڕانێکی زۆر بووە، ئەم گۆڕانکارییانەش ڕوونکەرەوەی فراوانبوونی پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان بووە بەسەر لۆژیکی فیقهەوە، کە هەمان زانستی ئوصولە کاریگەریی زۆری بەجێهێشتووە. لە بەرامبەر ئەم گۆڕانکارییانەشدا زانایانی موسڵمان بێدەنگ دانەنیشتوون و بەردەوام لە رووبەری شوێن و کاتدا پەرچەکرداریان هەبووە، فیقهی خۆیان هاودەنگ لەگەڵ بارودۆخی کۆمەڵایەتیدا تۆمار کردووە. کۆمەڵگای ئیسلامی لە

---

١- مناع القطان، التشريع و الفقه فی الاسلام، ص١٢.

٢- احمد زكي تفاحة، الاسلام والحكم، ص٢٣٠ـ ٢٣٦.

دێرزەمانەوە نوێبوونەوەی فیقهی ئیسلامییان ناسیوە، هەروەك (عمر بن عبد العزیز) کاتێك دەیفەرموو: (بۆ خەڵکی بە هەمان ئەندازە کە بابەتی نوێ پێش دێت، ئەحکامی نوێ دەناسرێت). زانایان ئەم لایەنخوازییەیان درێژە پێداوە و ئیجتیهادیان وەك ڕێگای نوێبوونەوە و کامڵبوون هەڵبژاردووە.[1]

١٤ـ زانستی فیقه، زانستێکی دونیایی و ئاخیرەتییە: ئیمامی غەزالی فیقه بە زانستی دونیایی ناو دەبات و زانایانی ئەم بوارەش بە (علماء الدنیا)[2] زانایانی دونیا ناو دەبات. ئەم بۆچوونە لەگەڵ قۆناغێك لە مێژوودا هاوڕایە کە فیقه و ژیان پێکەوە بەسرابوونەوە و فیقه ژیانی خەڵکی ڕێکدەخست و ڕێنموونیی دەکردن لە کاروبارەکانی ڕۆژانەیاندا، بەڵام کاتێك کە ئەم پەیوەندییە لێکپچڕا کە چیتر فیقه شێوازێکی تری لەخۆ گرتبوو، بە زانستێکی ئاخیرەتیی تاکگەرا و گەڕیدەی رزگاربوون گۆڕا.[3]

کەوایە ئەنجام وەردەگرین، کە فیقه هەم دەتوانێت زانستی دونیا و ڕێنموونکاری دونیای خەڵك و ئاڕاستەکردنی تاك و کۆمەڵگا بێت، هەمیش دەتوانێت زانستی ئاخیرەت و بەڵگەی رزگاربوون، پاکیی نیەت، نزیکبوونەوەی مرۆڤەکان بێت لە خودا. لە هەلومەرجی ئیدئالدا ئەو توانایەی هەیە کە دونیا و رۆژی دوایی مرۆڤەکان ڕێکبخات، لە هەمان کاتی نزیکخستنەوەی بە پانتایی نزیکبوونەوە لە خودا بەختەوەری و بە ئارەزوو گەشتویی دونیاییش بۆ خەڵکی بە دیاری بهێنێت.

١٥ـ فیقه زانستێکی سەربەخۆیە: دیارە کە عەرەبەکان بەتایبەت قورەیش، بە کاروانە بازرگانییەکانیان هاوینان بۆ شام و زستانان بۆ یەمەن سەفەریان دەکرد، ئەم ڕێڕەوی و گەشتانە بێگومان جۆرێك لە گۆڕینەوەی کولتووریی لەگەڵدا بووە. شتێکی سروشتییە کە

---

١ - محمد قطب، التطور والثبات فی حیاة البشر، ص٣٩.

٢ - امام غزالي، احیاء علوم الدین، بەرگی ١، پەرتووکی العلم- بەشی دووەم.

٣ - محمد مهدي شمس الدین، مقاصد الشریعة، چاوپێکەوتن لەگەڵ گۆڤاری (قضایا اسلامیة معاصرة)، ژمارە ٩-١٥- ل١٠.

هەندێك دابونەریتی ڕۆمییەکان لەم ڕێگەوە گوازرابێتەوە بۆ کۆمەڵگای عەرەبە جاهیلییەکان، لە دوایدا لە ئاڕاستەپێدانی فیقهی ئیسلامیدا کاریگەریی هەبووبێت، گریمانەیەکی هاتووە، بەڵام دوورە، بەتایبەت کە دەزانین شەریعەتی ئیسلام هەندێك دابونەریتی سەردەمی نەزانیی کەم یان زۆر، هێشتووەتەوە.

ڕۆژهەڵاتناسێك هەمان ئەم ئەگەرەی دووپاتکردووەتەوە، دەڵێت: (یاسای کۆنی عەرەب، لەژێر کاریگەریی هۆکارەکانی یەهودی و مەسیحیدا گۆڕاوە. شەریعەتی ئیسلامی لەسەر بنەمای ئەم یاسایە بونیاد نراوە کە بەدەستی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) چاکسازی و ڕاست کردنەوەیان تێدا کراوە.

(لامپر) کە یاساناسێکی گەورەیە، بڕوای وایە کە بۆچوونە یاساییەکانی (ڕۆمەکان) لە پەرتووکی (تلمود) کاریگەریی هەبووە، بەم هۆکارە هاتووەتە نێو فیقهی ئیسلامییەوە.[1]

نووسەرانی هاوچەرخ لە دونیای ئیسلامدا هەوڵی زۆریان داوە کە ئەم بۆچوونانە بەگشتی بدەنە دواوە. ئەوانە بەجۆرێك کینە کێشان و دوژمنایەتیی سەرهەڵداو لە هزری داگیرکەرانەی ڕۆژهەڵاتناسان هەژمار بکەن، بەتایبەت کە جوڵەی ڕۆژهەڵاتناسی بە هاندەرێکی نازانستییانە بەڕێکەوتووە و خەمی هەمیشەیی بە هەند وەرنەگرتنی فیقهی ئیسلامی و هەتا ناڕاستبوونی سەرچاوە و بابەتەکانی ئەو بووە.

پڕمتمانەترین بەڵگەی رۆژهەڵاتناسان بۆ سەلماندنی داواکانیان بریتییە لە:

أ - لێکچوونی هەندێك یاسا و ئەحکامی ئیسلامی لەگەڵ هەندێك ئەحکامی نێو یاساکانی ڕۆم.

ب - لێکچوونی هەندێك ئەحکامی فیقه لەگەڵ ئەحکامی دانراوی یەهود.

ج - ئاگاداربوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) لە یاساکانی رۆمەکان تا ئەو جێگەی کە ڕۆژهەڵاتناسی ئیتاڵیایی (کاروزی) بانگەشەی ئەوەی کردووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) ئاگاداریی زۆری هەبووە لەسەری.[1]

---

١ - د. صوفي أبو طالب، تطبيق الشريعة الاسلامية فى البلاد العربية، ص٩٤.

د- پێشەوایانی ئاینزا لەوانە (ئەوزاعی ـ شافیعی) زۆرێك لە یاساكانی ڕۆم و بیزانسیان ناسیوە، بۆ نموونە یاسای (البینة علی المدعی)، بەهۆی ئەوەی كە لە سووریا لەدایك بوون.[2]

و- قوتابخانەكانی (ئەسكەندەریە - بەیروت) پاش ڕزگاركردنیان لەلایەن موسڵمانانەوە، هەروەك خۆیان مابوونەوە، بەتایبەت كە ماوەیەكی زۆرباش لە دوای ڕزگاركردنیان یاساكانی ڕۆم لەو قوتابخانانەدا دەخوێنران.[3]

ی ـ زانایانی دیمەشق و بەغداد، لەگەڵ خۆیاندا فیقهی زۆر سادە و سەرەتاییان پێبوو كە نەیدەتوانی وەڵامدەرەوەی داواكارییەكانی خەڵكی سووریا و عێراق بێت، لەبەرئەوە ناچار بوون كە سیستەمێكی یاسایی نوێ دابنێن بۆ وەڵامدانەوەیان، لە ئامرازەكانی ڕۆم و بیزانت سوود وەرگرن.[4]

بۆ ڕەتكردنەوەی داوا و بەڵگەكانی پەیوەست پێوەی، ئەوە بەسە كە ئاماژە بەم خاڵانەی خوارەوە بكەین:

١ـ بوونی لێكچوون لە نێوان دوو یاسا و دوو سیستەمدا بەڵگە نییە لەسەر كاریگەری و وەرگری كاریگەریی یەكێكیان لەسەر ئەوی تریان، بە پێی ئەو بەڵگەی كە فیقهی ئیسلامی نەك یەك مەزهەبە، بەڵكو چەندین مەزهەبی لەخۆ گرتووە، بەڵام هیچ مەزهەبێك لە بیروبۆچوونە فیقهییەكانیدا دواقسە ناكات. كەوایە ئەگەر بڕیار بێ مەسەلەیەك لە مەزهەبێكدا لە مەزهەبە ئیسلامییەكان، هاوڕا یان وەك یاساكانی ڕۆم بێت، بۆچوونەكانی مەزهەبەكانی تر بە چ شێوەك ئاڕاستە دەكەن؟

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ل٩٦.

٢- عبد الرحمن البزاز، الموجز فی تأریخ القانون، ص٢٦٨.

٣- سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٨.

٤- صوفی ابو طالب، تطبیق الشریعة الاسلامیة فی البلاد العربیة، موجز فی تأریخ القانون، ص٢٦٨.

بۆ نموونە ئەگەر بۆچوونی مەزهەبێك لە یاسای ڕۆم یان بیزەنتییەکان وەرگیرابێت، ئەی ئەوانی تر لەچی وەرگیراون؟ ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە ئەگەر لێکچوونەکان بە بەڵگەی داواکانی خۆیان دەزانن، ئایا جیاوازییەکان بە بەڵگەی جیاکردنەوەی سیستەم و بورهان بۆ بەرهەڵستکارانی خۆیان نابینن؟

سەروتر لەمانە، نابێت جیاوازیی نێوان دوو بۆچوونی رۆژئاوایی و ئیسلامی سەبارەت بە ناسینی یاسا و سەرچاوەکانی، لەبەرچاو نەگرین، واتا ئەگەر بە هۆی فراوانکردنی دەسەڵاتیانەوە موسڵمانان لەگەڵ خۆیاندا یاسایەکی بەکارهاتووتر و باشتریان لە یاساکانی ئەوان لەدەستدا نەبوایە، ئایا فیقهی ئیسلامی بە شێوازێکی لەوجۆرە ڕواڵەتی دەگرت؟ یاخود ئەوەی بە ناونیشانی فێرکاریی ئاینی لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان، لە نێو کولتووری ئەوانی تردا دەتوایەوە.. شتێك دەمایەوە کە تێکەڵکردنێك بوو لە بۆچوون، دابونەریت و یاسای نەتەوەکانی هاتووە ژێر دەسەڵات لە سەردەمی رزگارکردنیاندا؟

ڕۆژهەڵاتناسی بەویژدان (نیلینو) بۆ ئەم لایەنە چەند نموونەیەك دەنووسێت:

* کڕین و فرۆشتن لەلای یۆنانییەکان گرێبەستێکی پراکتیکی بوو (عملي)[1] لە کاتێکدا هەموو ئاینزا فیقهییەکان کۆدەنگییان لەسەر ئەوەیە کە گرێبەستێکە بە (صیغة) پێویست بوون (لزوم) پەیدا دەکات.

ئەم ڕاجیاوازییە بە هۆی بەرهەڵستیکردنی موسڵمانان لەگەڵ یاسای بیزانسدا نییە، هەروەها سەرهەڵداوی جیاوازیی نێوان گرێبەستی کرداری و گرێبەستی گوفتاری نییە، واتا نە ئەمە و نە ئەو، بەڵکو لەسەر بنەمای یەکێك لە ئایەتە قورئانییەکانە کە دەفەرموێت: (إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ).[2]

* کاتێك کە عەرەبەکان توانییان لە ماوەیەکی کەمدا بەپیتترین ناوچەی دەسەڵاتی بیزانس بخەنە ژێر حوکمڕانیی خۆیانەوە، دیتیان کە ڕەهنی (عقاري) (ڕەهنی ئەو

---

١- عەقدی عەمەلی-contracteel.

٢- سورەتی (النساء)، ئایەتی ٢٩.

شتانەی کە ناگوێزرێتەوە، وەك زەوی) غير منقول hypotheau زۆر باوبووە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم سیستەمە نەهاتووەتە نێو فیقهی ئیسلامییەوە، مەگەر لە سەردەمی ئێستادا، ئەویش لەژێر کاریگەریی یاساکانی ڕۆژئاوادا.

* بەکرێدانی زەوی بۆ ماوەیەکی درێژ (Emphyteotiques) کەمتر لە ناوچە ئازادکراوەکاندا باوبوو، بەڵام بە تێپەڕینی کات و سەدەکان ئەم مامەڵە هاتە نێو فیقهەوە، هەرچەند هەموو مەزهەبەکان ئەمەیان وەرنەگرت.

بە خوێندنەوەی ئەم نموونانە بۆمان ڕووندەبێتەوە کە فیقهی ئیسلامی بە سەرنجدان لە بنەماکانی یاسادانان و سەرچاوەکانی، کەسایەتییەکی سەربەخۆ و جیهانێکی قائم بە زاتی هەیە (وەستاو بە خودی خۆی هەیە).[1]

٢ـ لە وەڵامی ئەوانەیدا کە شەریعەتی ئیسلامی بە وەرگیراو لە شەریعەتی یەهود دەزانن، بەتایبەت لە (تلمود) بۆچووندای دەکەن، ئەوە بەسە کە پێیان بڵێین:

ئەگەر مەبەست هەمان ئەو ئەحکامانە بێت کە قورئان ڕاشکاوانە باسیان دەکات، کە لە نێو بەنی ئیسرائیلدا کاری پێکراوە و بۆ موسڵمانانیش بە هەمان شێوە کاریگەرە، بۆخۆی بەڵگەی یەکبوونی هەر دوو ئاینی ئیسلام و یەهودییەتە. ئێمە نەك تەنها بەرهەڵستیی ناکەین، بەڵکو زانایانی ئوصولیی ئێمە هەڵوێستی خۆیان لە بەشەکانی شەریعەتەکانی پێشوو هەبووە و ڕاڤە و ڕوونکردنەوەیان بۆ کردووە، ئەوانەیان نەك لە هەواڵەکانی دینی یەهود، بەڵکو لە خودی قورئانی پیرۆز و حەدیسەکانی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لێبێت) وەرگرتووە، پەیوەندیی بە لێوەرگرتن و ئیقتیباسەوە نییە. بەتایبەت کە قورئان سەبارەت بە یەهود لە سەردەمی هاتنی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لێبێت) یەهود لە سەردەمی پاش موسا، هەموو بەنی ئیسرائیل بۆچوونێکی زۆر نەرێنیی هەیە، موسڵمانان لە سەردەمی کۆچی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لێبێت)

---

١ - د. عجيل جاسم النشمي، المستشرقون ومصادر التشريع الاسلامي، ص٢٣٢-٣٣٠.

تاکو سەردەمی خەلافەتی حەزرەتی (عومەر)، تا بە ئەمڕۆش، لەگەڵ یەهودییەکاندا بەردەوام لە ململانێدا بوون و هەن.

٣ـ ئەو بۆچوونەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) پاش ئاگاداریی تەواو لە یاساکانی ڕۆم و بیزانس دەستی بردووە بۆ دانانی شەریعەت، بێ بەڵگەیە و بونیادەکەی حەز و کینە و ئارەزووە، چونکە قۆناغەکانی ژیانی ئەو مەزنە لە منداڵییەوە تاوەکو بوون بە پێغەمبەر، لە کەس شاراوە نییە. ئەوەی کە ڕۆژهەڵاتناس (کاروزی) باسی لێوە دەکات، ناتەواو و زۆر منداڵانەیە، ئەم کەسە کە ئەوەندە پێداگری و دڵسۆزیی بۆ حەقیقەت هەیە، باشتر ئەوە بوو کە ڕاپۆرتەکەی خۆی کامڵ و خاڵە تاریکەکانی تا ئەندازەیەك ڕوونکردبایەوە. بۆ نموونە بیگوتبا کە پێغەمبەر لە چ کەسانێك و لە چ کاتێك و بە سوودوەرگرتن لە کام سەرچاوە فێری وەها زانیارییەك بووە.

چونکە تەنانەت دوژمنەکانی لە سەردەمی ژیان و لەو ساتانەی کە دەرکەوتەی پێغەمبەرایەتی پێویستی دەکرد، نەیان دەدا بە گوێیدا، یان لە نێو خەڵکیدا بڵاویان نەدەکردەوە ئەوەی لە دەستیدایە و لە زمانیدایە وەرگیراوە لە خەڵکانی ترەوە، بەتایبەت ڕۆمەکان! کەوایە ڕووندەبێتەوە کە بنەمای ئەو بۆچوونە تەنها گومانە و مەزەندەیە، نەك زانست و یەقین.

٤ـ لێکۆڵینەوە لە ژیانی پێشەوایانی فیقه، بەتایبەتی (ئەوزاعی و شافیعی)، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەسەلمێنێت ئەوەی لەلای ئەوان گرنگیی هەبووە لە کاری هەڵگۆزیندا، تەنها گەڕانەوە بووە بۆ قورئان و سوننەت، لە پاش ئەم دوو بنەمایە هیچ بنەما و سەرچاوەیەکی تریان بە فەرمی نەناسیوە تاکو سوودی لێ وەرگرن بۆ ئیجتیهادی خۆیان، تەنها لەدایکبوونی ئەوانە لە شوێنێکدا کە پێشتر جێگای شاڵاوی ڕۆمییەکان بووە، یان تەنها ئەگەری ئەوەی لە پاشماوەی یاسایی ڕۆمەکان چەند خاڵێکیان وەرگرتبێت لە پێودانگەکانی باسە زانستییەکاندا، ناتوانێت داوایەکی لەم جۆرە لە سەکۆی سەلماندندا دابنیشێنێت، بەتایبەت کە بەڵگە مێژووییەکان پێچەوانەی ئەم داوایەن و عەقڵ و هزریش بە دووری دەزانێت. کەسێکی وەکو (ئەوزاعی) کە ڕاجیاوازیی زۆری هەیە لەگەڵ ئەبو

حەنیفەدا و هەرکات بە پێویستی زانیوە ئاماژەی بەم بۆچوونە و بیرە جیاوازانە کردووە، پایەبەندبوونی خۆی سەبارەت بە حەدیس چەندین جار ئاشکرا کردووە، ئەی بۆچی هیچ کات بە ناوی هاوڕابوون، یان بەرهەڵستیی یاسایی لە یاسا غەیرە ئیسلامییەکان، بەتایبەت ڕۆمییەکان، باس ناکات؟ بۆچی لە سەردەمەکانی دەمارگیریی مەزهەبییەکان بەرهەڵستکارانی شافیعی ئەم ناتەواوییانەیان بۆ لێسەندنەوەی ڕێگەپێدراوی لە دیدگای فیقهی ئەوەوە لەبەرچاو نەگرتووە؟

کەوایە ئاشکرا دەبێت ئەوەی لەم بارەوە پێنووسی رۆژهەڵاتناسان نووسیویانە، هیچ بنەمایەکی نییە جگە لە گومان و پێشبینی، دیارە گومان هیچ پشکێکی حەقیقەتی لەگەڵ نییە.

٥ـ لەبارەی رۆڵی هەردوو قوتابخانەی ئەسکەندەریە و بەیروتەوە، بەسە بۆی کە ئەو ڕاستییە مێژووییە وەبیر بهێنێتەوە سەردەمێکی زۆر پێش ئازادکردنی ئەو سەرزەوییانە، ئەم دوو قوتابخانەیە ناوێکی بێناونیشان بوون، چونکە قوتابخانەی ئەسکەندەریە زیاتر لە سەدەیەك پێش رزگارکردنی میصر بە فەرمانی ئیمپراتۆری ڕۆمییەکان، دەرگاکانی داخراوە. مێژوونووسان لەم بارەیەوە دەڵێن:

ئیمپڕاتۆر (ژۆستنیان) لە ڕێکەوتی ١ی دیسەمبەری ساڵی ٣٣ی میلادی فەرمانێکی دەرکرد کە هەموو قوتابخانەکان جگە لە قوتابخانەی ڕۆم و قوستەنتینیە، دابخرێن.[١]

قوتابخانەی بەیروت بەهۆی زەمینلەرزەوە لە ساڵەکانی پاش (٥٥١) چیتر هەواڵێك لێی نەبوو.[٢]

٦ـ دەربارەی سوودوەرگرتنی فەقیهەکانی دیمەشق و بەغداد لە یاساکانی ڕۆم بەهۆی بەسنەبوونی کەلەپوری فیقهی ئیسلامی، ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ قۆناغی ئاڵۆز و

---

١- د. صوفي ابو طالب، تطبيق الشريعة الاسلامية، ص١٠٢.

٢- نظام الدين عبدالحميد، مفهوم الفقه الاسلامي، ص٧٤.

نوێدا، تەنها ئەوە بەسە کە توێژینەوە بکەین لە سەرچاوە فیقهییەکاندا، بنەماکانی هەڵگۆزینی ئەو دەستە لە فەقیهەکان تێبینی بکەین:

١ـ ڕێکەوتن لەگەڵ بارودۆخی نوێدا، گەڕان بەدوای باشترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە حوکمی شەرعی، سوودوەرگرتن لە شێوازی بەکارهاتووانە هەرچەند لە دەرەوەی دونیای ئیسلام وەرگیرابێت، لە سیستەمە یاساییەکانی ترەوە بێت، کارێك نییە پێچەوانەی بنەماکانی ئیسلام بێت، بە مەرجێك نەبێتە هۆی خراپەکاری و لادان لە بنەماکان.

٢ـ فەقیه بەردەوام ئەرکدارە بەوەی کە بڕیارەکان لە چوارچێوەی کات و شوێندا هەڵبگۆزێت، پاشان بیگەیەنێتە پلەی جێبەجێکردن. واتا فەقیهێك کە لە کۆمەڵگای ئاڵۆز و پێشینەداری عێراقدا فتوا دەدات، پێویستە داکەوتەکان دەرك بکات، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوانە بڕیار دەربکات، یان حوکم دەربهێنێت. نەك وەها سەیری ئەو کۆمەڵگایە بکات وەك کۆمەڵگایەکی سەرەتایی، یان خێڵەکی کە سادەیی و ئاسانکاری تانوپۆیەتی.

خاڵی کۆتایی: ئەوەی کە فەقیهەکان لە پەنای سەرچاوە سەرەکی و ڕەسەنەکانی وەك قورئان و سوننەت گەڕاونەتەوە بۆ سەرچاوەکانی تر، وەك نەریت و بەباشزانی (استحسان) زۆر جار لەو خاڵانەی کە دەقێکی ڕوون نەبووە، ئەم سەرچاوانەیان بە ناونیشانی بنەمای کاری فیقهیی خۆیان بەکارهێناوە، لە ئەنجامدا ئاڕاستەی ئەوان هزری و ئامانجگەرا بووە، پەیوەندیی بە لێوەرگرتن و ئیقتیباس لە یاساکانی ڕۆمەوە نەبووە. بەم هەلومەرجە ناتوانین بنەمای وەرگرتن، کاریگەری و گونجاویی زانستی فیقه، لە (ژینگەی کۆمەڵایەتی و کولتووری خەڵك و دابونەریتی خەڵك و نەتەوەکانی دراوسێ بەگشتی، ڕەتیان بکەینەوە یان بەرهەڵستییان بکەین، چونکە ئەم بابەتانە لەجیاتی ئەوەی نیشانەی لاوازی بن، بەڵگەی هێز و دەسەڵاتدارییە، ڕوونکەرەوەی ئەو ڕاستییەیە کە کۆمەڵگا سەبارەت بە دەسکەوتە زانستییەکانی ئەوانی تر نابێت بێ هەڵوێست

بمێنێتەوە، بەتايبەت کە لە حەديسدا هەيە (الحكمة ضالة المؤمن أنّى وجدها فهو أحقّ بها).[1]

واتا: (حيکمەت ونبووی مرۆڤی موسڵمانە، لە هەر شوێن و هەر کاتێك دۆزييەوە ئەو لەپێشترە پێی لەوانی تر).

١ - (ترمذي) و (ابن ماجة) ڕيوايەتيان کردووە، المعجم الفهرس لالفاظ الحديث النبوي، ج١، ص٤٩١.

## ١-٣- نوێبوونەوەی فیقھ

هەندێك جار فیقهی پێشڕەو لە بەرامبەر فیقهی کلاسیکدا بەکاردەبەن، کە هەڵبەت ئەمە ناوزەد کردنێکی ڕاست نییە، لەبەرئەوەی ئێمە لە لایەك نوێبوونەوەمان بە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی فیقهی ئیسلامی و لەبەرترییەکانی ئەو بە درێژایی مێژوو لەبەرچاو گرت، لە لایەکی ترەوە لەو ڕووبەڕووبوونەوەیە وا دێتە پێش چاو کە فیقهی کلاسیك بەشێکە لە فیقهی نوێ، واتا بەوە دانانرێت کە بە تەواوی جیا بێت لەو، بە جۆرێك نە فیقهی کلاسیك لەخۆگری نوێبوونەوە و نە نوێبوونەوەش سەرهەڵداوی فیقهی کلاسیك بێت. لە کاتێکدا کە فیقهی کلاسیك دەتوانێت سەبارەت بە کات و سەردەمی خۆی، هەروەها بە سەرنجدان لە ڕێرەوی هەنگاو بە هەنگاوی فیقھ بە ناونیشانی بەڵگەیەك لە بەڵگەکانی تری نوێبوونەوەی فیقھ، بێت.

وەك هەمیشە ناتوانرێت فیقهی گۆڕاو بە جیا لە مێژوو تێبگەین، یان لەبەرچاو بگرین، چونکە ئەساسی نوێبوونەوەی وەك یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی، هاوکات نییە لەگەڵ شێوازگیریی فیقهدا، بەڵکو کاتێکە کە فیقھ هێشتا لە منداڵانی شەریعەتدا نوتفە بووە.

لەبەرئەوە فیقھ چ کلاسیك چ سەردەمیانە، بەردەوام گۆڕاو و لەخۆگری جوڵانو کامڵبوون بووە، هەرچەندە فیقهی سەردەمێك جیاوازە لەگەڵ فیقهی سەردەمێکی تردا. واتا بەرەوپێشچوونی ئەم زانستە ناچارە بە پەیڕەویکردنی لە شێوازی مێژووی کامڵبوونی زانستەکانی، بە شێوەیەکی سروشتییانە و لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا و لە هەلومەرجێکی لەباردا ڕێرەوی تەواوکاریی خۆی دەبڕێت.

خاڵی گرنگ لێرەدا نەك گومان دروستکردنە لە وەسفی نوێبوونەوەدا، بەڵکو لە دانانی ڕێژە نیشانەکانی دەرکەوتەی ئەوە.

واتا ئێمە دەبێت پێشەنگی و نوێبوونەوە بە درێژایی مێژوو شناسایی بکەین، ڕووبەڕوو دەبینەوە لەگەڵ فەقیهەکان و ئوصولزانە گەورە مەزهەبە بەرچاوەکان.

پەرتووکە گرنگ و بە بەهاکان، کە لە یەك چرکەی هەستیاری مێژوویی و لە هەلومەرجی لەباردا دەرکەوتوون، لە شێوازی وەرگرتنی بونیادی فیقهی ئیسلامیدا پشکیان هەبووە.

بە پێی تێڕوانین لەوەی فیقه بەدرێژایی مێژوو بەرز و نزمیی هەبووە، هەندێك جار پێشڕەوی کولتووری سەردەمی خۆی، هەندێك جار گرفتاری نەخۆشیی تەقلید بووە، دەبینین کە دوو دیدگای جیاواز لە نێوان دوو توێژ لەوانەی سەرقاڵن بە زانستی فیقهەوە، پەیدا بووە:

١ـ لە نێوان توێکڵینەکان (قشریون)، کە شەریعەت تەنها لە سنووری پیت و واژەدا و بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئامانجەکان و مەبەستە گشتی و زۆرەکانی، ناسیویانە، فیقهێکی چەقبەستوو و وەستاوە. دروست بووە کە ڕەفتاری مرۆڤەکان بەبێ هەڵسەنگاندنی لایەنی بابەتەکان و مەبەستی دانەر و بەبێ سەرنجدان لە هەلومەرجی کات و شوێن و بارودۆخی کەسەکان، لەگەڵ چەسپاندنی ئەو دەقانەی کە هەن، لە قاڵب بدات.

٢ـ لە نێوان زانایانی ئاگا و ئاگادار لە لایەنە کۆمەڵایەتییەکانی دین، فیقهێك لەدایك بووە و هەڵدەسێتەوە و بە مەیدانی ژیان تاو دەدات، کە هەم مەبەستەکانی دانانی میلاك و هەم پێکهاتەی شوێن و کات و بارودۆخی ڕوولێنراوی لەبەرچاودایەو بۆ (بەرایترینەکان، جیاوازییەکان، میزانییەکان، داکەوتەکان) گرنگی زۆر قایلە.

فیقهی نوێبوونەوە هەڵگۆزینێکە کە سەرچاوەکەی، سەرچاوەکانی پیرۆزی ئیسلامە و جێگەکەی نوێبوونەوەی بۆنەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە. فیقهی گۆڕاو فیقهی ژیانە. ئەو نەك تەنها لەگەڵ پێشکەوتنی زانستی و دەرکەوتە نوێیەکاندا ململانێ ناکات، بەڵکو پێشکەوتنەکانی ئەمڕۆ دەکاتە پردێك بۆ گەیشتن بە پێشکەوتنە ئیجتهادییە نوێترەکان.

فیقهی ڕوون، ڕاستەقینە و پوختەیە، هەم کلاسیکە، هەم نوێبووەوە.

کلاسیکە، چونکە دەرونمایەکەی قورئان و حەدیس و ئەزموونی فەقیهە لەخواترسەکانە، نوێبووەوەیە، چونکە لە بریتی ئەوەی لە بیر و دەسکەوتەکانی سەلەفدا زیندان بێت، لەوان پردێك بۆ بەدەستهێنانی بەها و چالاککردنی فیقھ دروست دەکات.[1]

کەوایە ئێمە فیقهی نوێبووەوە لە پەنای فیقهی کلاسیك و لە بەرامبەر فیقهی کلاسیك ناوزەد دەکەین، بەڵام باسکردنی ئەم خاڵەش پێویستە کە فیقھ بەرهەمی هزری ئیسلامیی زانایانە لە مامەڵەکردن لەگەڵ قورئان و سوننەتدا، بە مەبەستی نووسینی یاسا بۆ ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی، کەوایە هێز و دەسەڵاتی فیقھ، هەروەها لاوازی و لەناوچوونی بەڕێژەی وردبینی و داهێنانی، یان بە ئەندازەی بێتوانای و بێچارەیی ئەو هزرەوە بەستراوەتەوە، پەیوەندیی بە پیرۆزی و مەزنیی دەقەکانەوە نییە. بە دەربڕینێکی تر، نابێت وا بیربکرێتەوە کە پیرۆزیی دەقە دینییەکان بۆ ڕاڤەکردنەکان و تەئویلەکان دەگوازرێتەوە، سەرئەنجام ڕاڤە و تەئویلاتی مرۆیی لە دەقەکان هەم پیرۆز بێ و جێگەی قسە لەسەرکردنی نامێنێت و نابێت ئەوانە بە تایبەتمەندیی چەقبەستوویی و وەستاویی و دواکەوتنی تاریف بکرێ، چونکە دەقەکانی قورئان و سوننەت بەچاوداخستن لە بۆچوون و ڕاڤەکان پیرۆزن و سروشتێکی وەك جیهانی ئافراندنیان هەیە، هەر بەو جۆرەی کە بە سوودوەرگرتن لە ئامرازە پێشکەوتووەکان دەتوانرێت سوودی باشتری لێ وەربگیرێت. بە هەمان شێوە بە هزری پوختە، ئاگا و ئامانجگەرا، ئیجتیهاداتێك بەدەست دێت کە بە هزری ناپوختە، جوزئی و سەرپێیی، بەدەست نایەت.

کورتەکەی ئەوەیە کە جۆری ئیجتهاد پەیوەندیی زۆری بە کولتوور، ئاستی زانیاری، بیر و زانیارییەکانی کەسی موجتەهیدەوە هەیە، تا ئەندازەیەکی زۆر بە ئاسۆی ڕۆحی گەنجینەی هزری و چاوەڕوانیی ئەو لە دین، پێگەی دین لە دونیای ڕاستەقینەی ئەو، لە پەیوەندیدایە. هەروەها فیقهی نوێ هاومانا لەگەڵ ئیجتهادی نوێ، سەرهەڵداوی کۆمەڵگایەکی نوێبووەوە و بەرەوپێشچووە، لە هەلومەرجی ئایدیال و لە کۆمەڵگایەکدا

1- احمد نعمتی، ئیجتهاد و ڕێڕەوی مێژوویی ئەو، ل١٦-١٥.

که خۆی له بەرامبەر خود و خوای خۆیدا به بەرپرسیار دەزانێت، گیانی داهێنان و یاسای ژیانی خواپەرستییەکانە، مامەڵەکانی پەروەردە و ئەخلاق و سیاسەتی تاکەکان و توێژەکان و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی، بەشێوەیەکی گشتی شێوەی ڕواڵەتی هزر و دەروون و گیانی کۆمەڵی نوێبووە و جوڵاوبێت. ئەم بونیادە هەڵقوڵاوە لە شەریعەتی ئیلاهی و سوننەتی پەیڕەوکراو لە جیهاندا و خوازراوی سروشتی مرۆییە. کە یاسا و بڕیاری گونجاوە. لەگەڵ هەبوونی جێگیریی بنەما و چوارچێوەکانی، پێکهاتە، بڕگەکان و وردەکاری و تەفصیلاتی ئەو، گۆڕاو بێت.

به سەرنجدان له دوو جێباسی ڕابردوو، واتا چەمکی نوێبوونەوەی فیقە، تایبەتمەندییەکانی فیقە، دەتوانرێت خودی نوێبوونەوە لە بابەتەکانی خوارەوەدا سەیر و هەست پێ بکەین.

١ـ له پێناسه و ماهیەتی فیقه.

٢ـ له واژەکان و واژەناسیی فیقه.

٣ـ له سەرچاوە و ئامرازەکانی فیقه.

٤ـ له بابەتەکان و پرسەکانیدا (باس و بابەتەکان).

٥ـ له مەزهەبە فیقهییەکان.

٦ـ له زمان و شێوازی نووسین.

٧ـ له ئەرك و ڕۆڵی ئەو.

٨ـ له پەیوەندی لەگەڵ زانستەکانی تر.

٩ـ له ڕاڤەکردنی دەقە دینییەکان.

## ١ـ ٣ـ١ نوێبوونەوە لە پێناسە و ماهیەتی فیقهدا:

زانستبوونی فیقه له دەستەی بەڵگەنەویستەکانە، بەڵکو له پەسەندکراوەکانیشه. له هەموو ئەو پێناسانەی که بۆ فیقه نیشاندراوە، کەسێك نییه که فیقه به ناونیشانی لقێك له لقەکانی زانست نەناسێنێت، یان وەرنەگرێت. ئەوەی شوێنی باسکردن و شایانی

گفتوگۆ لەسەرکردنە، زانستبوونی فیقھ نییە، بەڵکو جۆر و سوود، بابەت و شێوازە سوودبەخشەکانیەتی. کەوایە ئەو یاسایانەی کە بەسەر ڕێڕەوی مێژووی (خوێندنەوەی زانست) دا فەرمان دەکەن، بەسەر ئەم زانستە ئیسلامییەشدا فەرمانڕەوان.

لە فەرھەنگی فەلسەفەدا ھاتووە (مەرجی زانست ئەوەیە کە بە ئەندازەی پێویست (وحدت[1] و (تعمیم[2]) دەستەبەر بکات. بەجۆرێك بێت کە خەڵکی نەتوانن لە دەرچوونی بڕیار سەبارەت بە مەسەلەکانی زانست، یەك بۆچوونیان ھەبێت، دەرکردنی بڕیار لەسەر بنەمای حەز و ئارەزووی تاکەکەس نەبێت، بەڵکو بنیاتنراو بێت لەسەر پەیوەندیی ڕاستییەکانی نێوان بابەتەکان، کە پلە بە پلە دەدۆزرێنەوە و بەشێوازی دیاریکراوی توێژینەوە جێگیر دەکرێت.[3]

بە سەرنجدان لە وتەکانی سەرەوە، بەم جۆرەی لێ بەدەست دێت کە زانستی فیقھ خاوەنی یەکبوونە لە بابەتدا (کرداری ڕوولێنراو) یەکبوونی ئامانج (گەشتن بە بەختەوەریی دونیا و ڕۆژی دوایی)، لەخۆگری ئەو یاسا و بنەما گشتییانەیە کە لە ڕێگەی چەسپاندنی پێشەکییەکان بەسەر بابەتەکاندا ھاتووەتە پێش و دەمانگەیەنێتە بڕیاری شەرعی. ئەم زانستە تا ئێستا پێشکەوتنی زۆری بەخۆوە دیوە، بەڵام نەگەیشتووەتە کۆتا ڕێگای خۆی و بەم زوانەش ناگات. فەقیھەکان بە بەکاربردنی ڕێگای دیارکراو کە زۆربەیان جێگای ھاوڕاییە، ھەوڵیان داوە ئەم زانستە لە حاڵی جوڵە و چالاکیدا بێت.

بە سەرنجدان لە پلەبەندیی فەلسەفەی کۆن و نوێ، لە (ئەرستۆ)وە تا بە (ئامپر) و (ئۆگست کۆنت) دەگات، ھەروەھا لەسەر بنەمای دانراوەکانی زانا مەزنەکانی وەکو

---

١ - یەکێتی.

٢ - گشتگیربوون.

٣ - جمیل صلیبا، فەرھەنگی فەلسەفی، وەرگێڕانی: منوچھر صانعی، ل٤٧٩.

(فارابی ـ ئیبن سینا)، زانستی فیقه زانستێکی (زانستی و نەقلی)[1] و (دەستووری و مێژووییە )، کە لە هەر لایەنێکەوە جیاوازی و سەربەخۆیی هەیە.

لە زانستە گوازراوەکان (تەفسیر ـ حەدیس ـ کەلام ـ سیرە ـ مێژوو) سوود وەردەگرێت، هەروەها لە زانستی هزری (عقلي)ی وەك (زانستە ئیسلامییەکان ـ فەلسەفە ـ ئەخلاق) سوود دەبات، بە زانستی مرۆیی نوێ وەك (دەروونناسی ـ کۆمەڵناسی ـ ئابووری ـ زانستی سیاسی) بایەخ دەدات، هەروەها مێژوویەکی بەردەوامی گەشە و کرانەوەی هەیە.

زانست بەردەوام لە سروشتی خۆیدا ڕەوتێکی زیندووە و بێ وەستانە. هەرکات وێنا بکرێت کە زانستێك گەیشتووەتە سنووری کامڵبوون، دەبێت بەمەرگ و کۆتاییەکەی بڕوا بهێنیت. زانست کاتێك ڕادەوەستێ کە زانا و بیرمەندان ڕاوەستن و بڕوایان بە پێشکەوتن و گۆڕان نەبێت، گۆڕانکاری بۆ خۆی بەڵگەی هێز و توانایی زانستە، نەك لاوازی و لەناوچوون، بەتایبەت ئەگەر لە ڕێگای کامڵبوون و هەڵەچنی و ڕەخنەگرتنەوە لە ڕابوردووان شێوازی وەرگرتبێت، چونکە هەر قسە و بۆچوونێکی نوێ کە دەردەبڕدرێت، لە دەروونیدا بۆچوونی ڕابوردوو و ڕەخنە لێگیراوی شاراوەی تێدایە.

مەعریفەی زانستی لە ڕاستیدا گۆڕاوە، واتا بەردەوام بە زانیارییە کۆنەکان زانیاریی نوێ زیاد دەبێت. لەم لایەنەوەیە، مەعریفەیەك کە لە زانستەوە لە دایك دەبێت، بەردەوام لە حاڵی فراوانبوون و کامڵبووندایە، سروشتێکی چڕبووەوەی هەیە، بەڵام ئەم چڕیی مەعریفانە لەوانەیە بە شێوەی ستوونی، یان ئاسۆیی بێت:

١ـ چڕبوونەوەی ستوونی: بەو لایەنخوازییە زانستییە دەگوترێت کە تێیدا زانستخوازان خەریکی گفتوگۆ و توێژینەوەی بابەتە کۆنەکان دەبن لە دیدێکی نوێوە، تێیدا دەگەنە دەسکەوتی نوێ، کە دەسکەوتەکانی ڕابوردوو دەبەنە ژێر پرسیارەوە.

---

١ – ئەو زانستانەی کە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگوازرێنەوە، وەك (حەدیس– ڕیوایەتەکان).

٢ـ چڕبوونەوەی ئاسۆیی: بەو لایەنخوازییە ناوزەد دەکرێت کە تێیدا زانایان بابەتی نوێ دەخەنەڕوو، بە گفتوگۆ و توێژینەوە لە پەراوێزیاندا، سەرقاڵ دەبن. کە هەڵبەت دەسکەوتەکانی ڕابوردوو بە دەست لێ نەدراوی دەمێننەوە[1].

ئێمە لە مێژووی فیقهدا، هەردوو لایەنخوازی بە باشی تێبینی دەکەین، لە لایەك فەقیهەکان بە باس و توێژینەوەی بەردەوام لە پەراوێزی ئەو بابەتانەی کە خراونەتە ڕوو لە ڕابوردوودا، سەرقاڵن، لە لایەکی ترەوە سەرنجیان خستووەتە سەر ئەو بابەتانەی کە پێشتر نەخراونەتە ڕوو.

کەمتر مەسەلەی فیقهی هەیە کە تایبەت دوو یان سێ قەولی لەسەر نەبێت. ئەو قەولانە یەکتر تەرك یان دوورناخەنەوە، بەڵکو هەموو پێکەوە شایەتی لە سەر فراوانیی زانست دەدەن.

## ١-٣-٢ نوێبوونەوە لە دەستەواژە فیقهییەکاندا:

یەکێك لە ڕێگاکانی نوێبوونەوەی **فیقە**، زانیاریی خەڵکییە لەبارەی تاکەکان، دەستەواژەکان، چەمکی فیقهەوە، بەهۆی ئەم زانیارییەوەیە کە خەڵکی لەگەڵ فیقهدا ئاشنا دەبن و لە ژیانی خۆیاندا بەکاری دەبەن. ئەگەر جیاوازی لەوەدا بێت، **فیقە** تەنها لە دەست فەقیهەکان و قوتابییەکانیاندا بێت و ئەوانی تر سەبارەت بەوەی کە لە مەودای فیقهدایە، بێ ئاگا یان کەم ئاگا بن، ئەو کات فیقە تەنها دەبێت، تەنها لە سنوورێکی دیاریکراوی ژیاندا و لە نێو توێژێکی تایبەت لە توێژەکاندا نوێبوونەوە بەدەست دێنێت. زانایان بە پەیڕەوی لە لۆژیکی دەسەڵاتدار بەسەر نووسین و دانانەوە لە سەرەتای چوونە نێو بەشێك لە بەشەکانی فیقهەوە، سەرەتا بە پێناسەکردنی بابەتەکە، پێشێلکردن و دووپاتکردنەوە، یان ڕەت، یان بەتاڵ کردنەوە و چارەسەر و نزیك کردنەوەوە، خەریك دەبن.

---

١- فؤاد زکریا، التفکیر العلمي، ص٢٣-٢٢.

به توندی پایەبەندی ئەم یاسا هزرییە بوون کە (التصدیق بالشيء فرع تصوره)، واتا سەرەتا شتەکە بهێنیتە پێشچاو، پاشان بڕیاری بۆ دەربکەیت. سەرەتا دەبێت بابەتەکە پێناسە بکەین، پاشان ڕاڤەی بۆ بکەین.

بەم شێوەیە یەکێك لە گرنگترین کارەکانی نەك تەنها فەقیه، بەڵکو هەر زانایەکیش، هەمان ڕاگەیشتنە بە پێناسە و واژەکان. لە ڕێگەی گەیشتن بە پێناسەیەکی (کۆکراوە و ڕێگر)، زۆرێك گفتۆگۆ و باسکردن و یاداشتی وردکراوە هەیە.

ئیسلام لە سەرەتای پەیدابوون و ڕاگەیاندنی دروستبوونیەوە، هەندێك واژەی نوێی لەگەڵ خۆی هێنا کە هەڵبەت پەیوەندییان لەگەڵ واژە پێشووەکاندا تا ڕادەیەك هەبوو، بەڵام ئیسلام ئەم زاراوانەی گۆڕی و بۆ لایەکی تر ڕێنمونیی کردن، (ابو هلال العسکري) لە پەرتووکی (الاوائل)دا دەنووسێت: (لە ئیسلامدا هەندێك واتا هاتە ئاراوە و بەو ناوانە ناونران کە لە سەردەمی پێش ئیسلام واتای تریان هەبوو).[1]

لێکۆڵەرەوەکانی ئەم جۆرە ناوانەیان بە ناوە ئیسلامییەکان باسکردووە، بۆ نموونە لە (المزهر)دا هاتووە: (زاراوەی پێش ئیسلام ناوێکە کە لە سەردەمی ئیسلامیدا بۆ کاتی پێش پێغەمبەرێتی دروست بووە، مونافقیش ناوێکی ئیسلامییە کە لە سەردەمی پێش ئیسلامدا نەناسراو بووە).[2]

موسڵمانان تێگەیشتوون کە واتا ئیسلامییەکان قورئان هێناونی، هەندێك واژە کە پێش هاتنە خوارەوەی قورئان باوبوون، پاشان گۆڕاون و واتای نوێیان بە خەڵکی گەیاندووە.

ئەو زانستانەی کە بە کاریگەریی ئاینی ئیسلام دروست بوون و لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا گەشەیان کردووە، مەیدانێکی باش بوون بۆ بڵاوبوونەوەی فەرهەنگ نووسین، کە بە هەڵسەنگاندنی لەچاو کۆمەڵگا و نەتەوەکانی تردا، لە ڕووی چەندێتی و

---

١- ابو هلال العسکري، الأوائل، ص٣٦-٣٥.

٢- السیوطي، المزهر في علم اللغة وآدابها، ج١، ص٣٠١.

چۆنێتییەوە باشترە. لەم نێوەندەدا ئەو پەرتووکانەی کە دەستەواژە فیقهییەکانیان ڕاڤە و پێناسە کردووە، دەبن بە سێ دەستەوە:

أ- ئەو پەرتووکانەی کە دەستەواژە فیقهییەکانیان لە نێو دەستەواژەکانی زانستەکانی تردا ڕاڤە و پێناسە کردووە:

١- كشاف اصطلاحات الفنون والعلوم، دانراوی: علامة محمد علي تهانوي.

٢- التعريفات، دانراوی: سيد شريف جرجاني.

٣- مفتاح السعادة ومصباح السيادة فی موضوعات العلوم، دانراوی: طاش كبری زادة.

٤- كليات أبي البقا الحنفي.

٥- فرهنگ علوم اسلامی، دانراوی: دكتر سيد جعفر سجادی.

٦- فرهنگ حقوقی، دانراوی: جعفر لنگرودی.

ب - ئەو پەرتووکانەی کە بە کورتکراوەیی دەستەواژە فیقهییەکانیان ڕوونکردووەتەوە و ڕاڤەیان کردووە، لە هەر خاڵێکیشدا بۆچوون و بیروباوەڕی فەقیهەکانی هەموو مەزهەبەکانیان بەدواداچوون بۆ کردووە و گواستوویانەتەوە، وەکو:

١- موسوعة جمال عبد الناصر في الفقه الاسلامي.

٢- موسوعة الفقه الاسلامي، دانراوی: الشيخ محمد ابو زهرة.

٣- موسوعة الفقه الاسلامي، وەزارەتی ئەوقافی کوێت.

٤- فرهنگ اصطلاحات فقه اسلامی، لێکۆڵینەوە و نووسینی د. محسن جابری.[1]

ج - ئەو پەرتووکانەی کە بە باسکردنی دەستەواژە ئوصولییەکان گرنگی دەدەن:

١- معجم مصطلحات اصول الفقه، دانراوی: الدكتور قطب مصطفى سانو.

ئەم پەرتووکە بە پشبەستن بە سەرچاوەی زانستی ئوصول نووسراوە و نزیکەی گشت دەستەواژەکانی ئوصولی هەموو مەزهەبە ئیسلامییەکانی لەخۆ گرتووە، بەڵام ئەو

---

١-د. محسن جابری، فەرهەنگی دەستەواژەکانی فقهی ئیسلامی، ل١٢-١١.

کەموکورتییەی هەیە کە بێ هێنان و نووسینی سەرچاوە و ئەو شوێنەی لێی وەرگرتووە، بە شرۆڤەکردنی دەستەواژەکانەوە خەریك بووە.[١]

## ١-٣-٣ نوێبوونەوە لە سەرچاوەکانی فیقهدا:

هەرکاتێك بگەڕێینەوە بۆ پەرتووکەکانی ئوصولی فیقه، چ کۆن چ نوێ، لەگەڵ ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگر ڕووبەڕوو دەبینەوە، ڕاستییەك کە بە تێپەڕبوونی کات، لە ئەنجامی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بارودۆخی جۆراوجۆر و هەلومەرجە کۆمەڵایەتییەکاندا دروست بووە. بە تەواوی بەڵگەیە لەسەر بزاوتن و کامڵبوون و نوێبوونەوەی فیقه، ئەو ڕاستییە بریتییە لە ـ کێشمەکێش ـ گفتوگۆ و ڕا جیاوازییە پەراوێزدارەکانی شەرعزان و ئوصولزانەکان لە بابەت سەرچاوەکان، بەڵگە و ئوصولی فیقه.

١ـ جەماوەری ئەهلی سوننەت (قورئان ـ سوننەت ـ اجماع ـ قیاس)یان بە ناونیشانی چوار بنەماکەی لێهەڵگۆزین وەرگرتووە. بەڵام لە (استصحاب ـ مصالح مرسلة ـ عرف ـ سد الذرائع، ڕای هاوەڵان و شەریعەتەکانی پێشوو) پێکەوە ڕاجیاوازییان هەیە.[٢]

٢- (ابن حزم) و زاناکانی تری مەزهەبی ڕواڵەتی (ظاهري)، (قورئان ـ سوننەت ـ اجماع الصحابة) بە بنەمای سیانیی لێهەڵگۆزین دادەنێن و بۆ قیاس هیچ بەهانەیەك دانانێن.[٣]

٣- ئوصولزانەکانی ئیمامیە: لە چوار بنەمای (قورئان ـ سوننەتی معصومین ـ کۆدەنگی ـ ئاوەز)دا کورتیان کردووەتەوە، لەکاتێکدا کە ئەخبارییەکان تەنها بە یەك بنەما کە ئەویش (سونەتی مەعصومین)ە، ڕازی بوون.[١]

---

١- گەڕانەوە بۆ: د. قطب مصطفی سانو، معجم مصطلحات اصول الفقه، چاپی یەکەم، دار الفکر، لبنان، سورية، ٢٠٠٠ میلادي.

٢ - عبد اللطيف البرزنجی، التعارض والترجيح، ج١، ص١٤١-١٣٤.

٣ - ابن حزم، الأحكام في الأصول الأحكام، ج١، ص٤٧- و ج٨، ص٢ بەدواوە.

٤ـ ئیمام مالیك و هاوەڵانی بۆ ڕەفتار و هەڵسوكەوتی خەڵكی مەدینە گرنگییەكی زۆر، قایل بوون، تا ئەو جێگەی لە زۆربەی بواردا بە ناونیشانی بەڵگە یان گەڕانەوە بۆی، هەڵیان بژاردووە.[2]

٥ـ تایبەت بە كۆدەنگی، بۆچوونی جیاواز زۆر باس كراوە تا ئەو جێگەی كە ئیمام (احمد بن حنبل) بە ئاشكرا ڕایدەگەیەنێت هەركەس ئیددیعای كۆدەنگی بكات، درۆ دەكات.[3]

٦ـ كردار بە بەرژەوەندییەكان: پراكتیكییانە هەموو مەزهەبەكان قبوڵیان كردووە، بەڵام هەندێك لەوانە وەكو ئیمامیە، لە ڕووی تیۆرییەوە ڕەدیان كردۆتەوە. بەڵام هیچ مەزهەبێك ئەوەندەی مەزهەبی مالكی بەهای پێنەداوە.[4]

٧ ـ استحسان (بە باشزانی)، حەنەفییەكان بەكاریان هێناوە، ئیمام مالك لە دە بەشی زانست نۆ بەشی بەمە دادەنێت. بەڵام ئیمام شافیعی سەرزەنشتی كردووەو فەرمویەتی (من استحسن فقد شرع) هەركەس بە ئیستیحسان ڕەفتار بكات ئەوە لە خۆیەوە شەرعی داناوە.[5]

٨ـ دەربارەی بەڵگە دانانی ئاوەز بەبێ پشتبەستن بە بەڵگەی شەرعی، بەو جۆرەی كە موعتەزیلە و ئیمامیە گوزارشتیان كردووە، بەڵام ئەشاعیرە و ئەهلی حەدیس و زۆربەی زانایانی ئەهلی سوننەت بەرەی پێچەوانەیان گرتووە، تەنها لەو جێگانەی كە پەیوەست نییە بە شوێنی نیزاعەوە رازین بەوەی كە (جوانی ـ دزێوی) ئاوەز دەركیان دەكات. بەڵام كاتێك لەسەر ئەساسی (المصالح المرسلة) بەرژەوەندییە ڕەهاكان

---

١ - محمد رضا المظفر، ج١، ص١٧. ج٢، ص٦٤.

٢ - د. زيدان، المدخل لدراسة الشريعة الاسلامية، ص١٦٣.

٣ - د. رفيق العجم، الاصول الاسلامية، ص١٢٢.

٤ - لەم بارەیەوە بگەڕێنەوە بۆ: الشنقيطي، مذكرة أصول الفقه، ص١٧٠-١٦٩.

٥ - الشوكاني، ارشاد الفحول، ص٢١١.

ورددەبینەوە، دەبینین کە لەم مەسەلەیەدا پێچەوانەی زاراوەیی پراکتیکیانە گەیشتوونەتە ئەنجامی لێکچوو.[1]

٩ـ ژمارەیەك لە سۆفییەکان لە پەنا ئەو بەڵگانەی کە باسکران (خورپەی دەروونی)یان وەك سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکان باس لێ کردووە. کە هەڵبەت زانایانی تر لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نین، بە پێچەوانەی گواستنەوەی ڕاست و هزری ڕوونی دادەنێن.[2]

١٠ـ بەڵگەکانی تری وەك قیاسی لۆژیکی، کە ئەهلی سوننەت لە بنەماکانیاندا بە (استدلال ـ بەڵگەسازیی) ناویان بردووە، (استقراء) کە ئوصولزانەکان بە لکاندنی تاك بە زۆرینە (الحاق الفرد بالأغلب) ناویان ناوە، لە ماوەیەکی دیاریکراودا سوودی لێ وەرگیراوە، بەڵام پاشان بە بێدەنگی ماوەتەوە. تا ئەوەی لە قۆناغەکانی دواییدا جێگای سەرنج بووەو بووەتە بنەمای هەندێك ئەحکامی شەرعی.[3]

ئەم ڕاجیاوازییە کە لە جۆری پەسەندکراوە، واتا جیاوازیی هەمەجۆری و فرەییە، بەڵگەیەك لە بەردەستدا نییە بۆ سەرزەنشتکردنی، لە هەمە جۆریی مەزهەبەکان و ئیجتهاد و ڕەوتەکانی بیری کۆمەڵگای ئیسلامیدا کاریگەریی هەبووە.

خۆی دەرکەوتە و باکگراوندێکی ترە کە بۆ بنەمای نوێبوونەوەی فیقه هەژمار دەکرێت، بەتایبەت لەم ساتە ئامادەیەدا کە بینەری ڕەوتی دیکەین، تایبەت بە سەرچاوەکان و بنەمای فیقه، کە داوای پێویستبوونی چاوپێداخشانەوە بە پێناسە، پەراوێز، ڕێکخستن، سوودمەندیی سەرچاوەکان و بنەماکانی ئوصولی باسکراودا هەیە. بۆ نموونە، ڕەوتێك کە بۆ فیقه تەنها بە یەك سەرچاوە کە هەمان قورئانە، قایل دەبێت،

---

١- بەرزنجی، جێباسی کەلامی لە ئوصول فقهی ئیسلامیی (نامەی ماستەر، بەرزنجی)، ل٢٣٧-٢٠٣,

٢- البرزنجي، التعارض و الترجيح، ج١- ص١٤٩.

٣- المحلى شرح جمع الجوامع- ج٢- ص٣٤٧-٣٤٥.

سوننەت نەك لە تەنیشت قورئاندا، بەڵكو لە دوای قورئان، واتە شتێك وەكو لایحەكانی یاسا لەبەرچاو دەگرێت[1].

ئەم لایەنخوازییە هەوڵ دەدات كە هەموو كەلەپووری فیقهی بخاتە ژێر پرسیارەوە. بە هاتنە نێو دونیاوە لە هەلومەرجێكی تایبەتدا لە مێژوو هەژماری بكات. بێ ئاگا لەوەی كە بردنە ژێر پرسیاری سوننەت، گومان و دوودڵی لە قورئانیش دروست دەكات، چونكە ڕێگەی سەلماندنی قورئان هەمان ڕێگەی سەلماندنی سوننەتە. هەر جۆرە تۆمەتێك بە مەیدانی سوننەت ڕەوا ببینین، بێگومان بە مەیدانی قورئانیشی رەوا دەبینین. پەیوەندیی نێوان قورئان و سوننەت یەكێكە لەو بابەتە گرنگانەی كە لەمێژەوە هزری زانایان و بیرمەندانی بەخۆوە سەرقاڵكردووە، چونكە بابەتەكە خۆی گرفت دروستكەرە لە لایەكەوە خوداوەند تەنها كەفالەتی قورئانی لە ئەستۆ گرتووە، موسڵمانان تەنها بڕوایان بە دەرچوونی قورئان هەیە، گومانی لێ ناكەن لە كاتێكدا سوننەت لەم پێگەیە سوودمەند نییە، زۆرجار لە دەرچوونیدا دەكەونە دوودڵی و گومانەوە، كەوایە سوننەت پاش قورئان دەبێت، سەرئەنجام كاتێك دەبێتە بەڵگە كە بەڵگەی قورئانی نەبێت لەبەردەستدا، ئەمەش لە لایەكی ترەوە.

خوداوەند هەرچییەك كە پێغەمبەر بە زمان دەیڵێت و دووپاتی كردووەتەوە، وەك وەحی (ئیلهام) هەژماری كردووە (وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى)[2].

لە بابەتێكی تر لە قورئاندا، خوای گەورە ڕوونكردنەوە، ڕاڤە و تەفسیركردنی سپاردووە بە پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ)[3].

---

١ - وەك نموونە (شیخ جمال قطب) نوێنەری دەستەی فتوای ئەزهەر ئەم بۆچوونەی هەیە. د. جمال عطية، ملامح التجديد الفقهي، ص٩٣.

٢ - سورەتی (النجم). ئایەتی: ٣-٤.

٣ - سورەتی (النحل) ئایەتی: ٤٤.

لەبەرئەوە، لە نێوان قورئان و سوننەتدا پەیوەستبوونێکی ئاشکرا هەیە، ئەم پەیوەست بوونەیە کە دیاریکردنی جۆری پەیوەندیی نێوانیانی تا ئەندازەیەك دژوار کردووە. ئەگەر سوننەت بە هاوسەنگی قورئان دابنێین، کارێکی هەڵەیە، چونکە قورئان جێگای هیچ گومانێك نییە، چونکە قورئان (قطعي الصدور ـ یەکلاکەرەوەی دەرچوو)ە، بەڵام سوننەت بە (ظني الصدور ـ گومان هەڵگری دەرچوو) ناودەبرێت. بەڵگەی بوونی سوننەت بەو جۆرە کە دیمان پشتی بە قورئان بەستووە، ئەمە بەڵگەی بەهێزی ئەوانەیە کە سوننەت پاش قورئان دادەنێن، واتا دەیخەنە پلەیەك دوای قورئان.

ئەگەر سوننەت دوای قورئان لەبەرچاو بگرین، لەو جێ مەسەلانەی کە قورئان تەنها حوکمی ئیجمالی (کورت) هەیە ناچارین بگەڕێینەوە بۆ سوننەت، ئەمە پێشخستنی سوننەتە بەسەر قورئاندا.

کەوایە دەبێت توانای سوننەت بە ئەندازەی توانای قورئان بێت، تاکو ئەو (وردبکاتەوە ـ بەکاری بهێنێت ـ تایبەتی بکات) بەتایبەت کە پەیامبەر (دروودی خوای لێبێت) لە حەدیسێکدا دەفەرموێت: (اوتيت الكتاب ومثله معه)[1]، ئەمە بەڵگەی بەرچاوی ئەوانەیە کە سوننەت دەخەنە ریزی قورئانەوە، لە پەنای ئەودا هەژماری دەکەن. هەموو سەرچاوە فیقهییەکان بینەری ئەو جۆرە گفتوگۆ، باس و ناکۆکییانەن لە نێوان خاوەن بۆچوونەکاندا هەیە و بڕواش ناکەم ئەم چیرۆکە کۆتایی هەبێت. ئەم بارودۆخە بۆ خۆی هۆکارێکە لە هۆکارەکانی نوێبوونەوەی فیقه. گونجاویی فیقه لە ڕاستیدا سەرهەڵداوی هەبوونی هەردوو بنەمای (بالفعل) و (بالقوة)یە، کە موجتەهیدەکان و ئوصوڵییەکان بۆ هەڵگۆزینی ئەحکام، بە فەرمی ناسیویانە. هەموان باس لە ڕۆچوون و هزرمەندی و بەدواداچوونە باشەکانی زانایانی ئومەت دەکەن، تا ئەو جێگەی کە دەتوانرێت ناکۆکی لە فەرعەکاندا بە بنەما و ناکۆکی لە بنەمادا بۆ هۆکاری (شوێن، کات، باکگراوەند) بگەڕێنرێتەوە، هەبوونی لایەنخوازییە جۆراوجۆرەکان و هەندێك جار ناکۆك لە بازنەی

---

١ - (أبوداود) ڕیوایەتی کردووە. أبوداود، سنن المصطفى، ج٢- ص٢٤٠.

ئومەتدا، بەڵگە لەسەر پانتایی، بێ نیازی، توانا، گەورەیی، بەرپرسیارێتی هەژمار بکرێت.

### ١-٣-٤- نوێبوونەوە لە بابەتەکانی فیقهدا:

فیقھ سەبارەت بە هەموو کردار و هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ هەڵوێست وەردەگرێت، فەقیهەکانی پێشوو گوتوویانە کە بابەتی فیقھ بریتییە لە کرداری ڕوولێنراوەکان، چ (تاکی یان گرووپی بێت)، (خواپەرستییەکان یان مامەڵەکان)، ئەوان بەم کارە بە جۆرێك پلانیان بۆ داهاتووەکان داناوە کە بۆ هەر جۆر چالاکی و کارێك کە مرۆڤ دەیکات، حوکمێك و بڕیارێك و یاسایەکیان هەبێت.

فەقیهەکان سەبارەت بە گۆڕانکارییەکانی ژیان و دەسکەوتە نوێیەکان، هەستیار بوون، بەپێی ئەو ئیمکاناتەی کە هەیانە و بە گرنگیدان بە زانستی سەرەکیی ئوصول فیقھ و یاسا فیقهییەکان، دەتوانن کارەکانی لەگەڵ بابەتە نوێیەکاندا پێشکەش بکەن.

لە ئێستادا لە ئاستە جیاجیاکانی ژیاندا بابەتی نوێ دێتە ناو، کە فەقیهەکان ناچار بە ئیجتیهاد و پێداچوونەوە دەکات. هەرچەند ئەم بابەتانە تایبەت نییە بە مەیدانی فیقهەوە، بەڵام بیرمەندانی موسڵمان ئەرکیان لەسەرە کە خاڵی بۆچوونیان لەگەڵ ئامرازە جێگیرەکانی ئوصول فیقهدا ئاشکرا بکەن. ئەم بابەتانە بە ئەندازەی خودی ژیان و جیهانی هاوچەرخ جۆراوجۆر و ئاڵۆزن، هەر لەبەر ئەوەیە کە فتوای سەردەم سودمەندە لە تازەیی و فراوانی و گرنگی. نەوەی نوێ بە حەز و ئارەزوویەکی بێسنوورەوە لە گەڕاندایە بەدوایاندا، لە هەموو بابەتەکانی فیقهی کۆندا و لە هەموو بەشەکانیدا، هەموو ئەو بابەتانەی تێدایە کە لە هەلومەرجی نوێدا گۆڕانکارییان وەرگرتووە، لە ئەحکامی ئاوەوە بگرە تا دەگاتە نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات، کە گریمانەی ئەوەیان لەسەرە ئەحکامی ئەوانە خاوەن نەگۆڕی و یەکلاکەرەوەییەکی زۆرن، چ بگات بە ئەحکامەکانی (ژن و مێردایەتی ـ مافی خێزان ـ مافی بازرگانی ـ فیقهی

سیاسەت ـ یاسای نێونەتەوەیی ئیسلامی) کە بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار شێوازەکان دەگۆڕێن.

ژیانی مرۆڤەکان لە هەموو لایەنەکاندا فراوانبوون و قووڵبوونەوەی زۆرتری دەسکەوتووە، لەبەر ئەوەیە کە فیقهی نوێ بەو بابەتانە ڕادەگات کە لەدایکبووی ئەم سەردەمەن، لە ئاووهەوایەکی جیاتر لە ئاووهەوای سەردەمی کلاسیکدا هەناسە دەدەن. لە دەستەی بابەتە نوێیەکان دەتوانرێت بە باتەکانی وەك–دیموکراسی ـ مافی مرۆڤ ـ مافی ئافرەت ـ بانقداریی ئیسلامی ـ کەڵك وەرگرتن لە تەکنەلۆژیا ـ قبوڵکردنی حیزب و پلورالیزم ـ هەڵبژاردن و سیستەمی پەرلەمانی ـ بیمە ـ کۆمپانیا هەرەوەزییەکان ـ گۆڕانکاری ژینیتیکی لە مرۆڤدا ـ ئاڵوگۆڕی کاڵا و شمەك لە ڕێگای دوورەوە....ئاماژە پێ بکەین.

بەم حاڵەوە هەڵسوکەوتی بیرمەندان و فەقیهە موسڵمانەکان، لەگەڵ هەریەك لەمانەدا، لە ژێر کاریگەریی هۆکارەکانی ژینگە و کات و شوێندا بووە، هەر کام لەوانە لە دیدگایەکەوە بۆ چارەسەری بابەتیی خاڵی بۆچوونی سەیری کردووە. بۆ نموونە بابەتی دیموکراسی لە نووسینەکانیاندا باس لەوە دەکات کە زۆربەیان لە هەڵوێستی نەیاری کردن لەگەڵیدا قەراریان گرتووە، هەڵوێسێکی تەواو توونديان هەیە سەبارەت پێی، ئەوانەی کە ویستویانە بێلایەنانە نزیك ببنەوە پێی، بە شوێن ئەوەوە بوون کە خاڵی هاوبەش و جیاوازیی نێوان ئیسلام و دیموکراسی دەس بخەن. بەڵام هیچ کات نەیانتوانیوە، یان نەیانویستووە بە دانانی تیۆرییەکی گشتی و فراوان دەربارەی دیموکراسی بگەنە ئەنجامێك. لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانرێت ئەو لایەنخوازییانەی کە لە پەراوێزی ئەم بابەتەدایە، لە چوار لایەنخوازیدا کورت بکرێنەوە.

**یەکەم:** لایەنخوازییەك کە هەوڵدەدات لە بەرامبەر دیموکراسیی رۆژئاوادا بە جۆرێك بگەڕێتەوە بۆ دیموکراسی، کە هەڵبەت ئەم لایەنخوازییە کێشەی دژبەیەکبوونی دیموکراسی و ئیسلامی تێپەڕاندووە، لە بونیادەوە باوەڕی وەهایە کە لە ئیسلامدا ڕیشەکانی دیموکراسی بوونێکی حەتمیی هەیە. لە دەستەی ئەو کەسانەی کە پەیوەستن

بەم لایەنخوازییەوە، دەتوانرێت بە کەسانی وەك (عباس محمود عقاد) خاوەنی (الديمقراطية في الاسلام)، دکتۆر محمد جلال شرف، نووسەری (نشأة التفكر السياسي وتطوره في الاسلام)، علي عبد المعطي محمد، نووسەری (الفكر السياسي في الاسلام)، احمد شوقي الفنجري، نووسەری (الحرية السياسية في الاسلام)، ئوستاد مالك بن نەبی لە پەرتووکی (حول الديمقراطية في الاسلام)، ئاماژە بکرێت، هەرچەندە ئەم دوواینەیان لە بەکارهێنانی دیموکراسیدا تا ئەندازەیەك دوورەپەرێزە.

**دووەم:** لایەنخوازی ئیسلامی، کە لە بەرامبەری دیموکراسیی رۆژئاوادا پەنا دەباتە بەر بونیادی شورای ئیسلامی، باوەڕی وەهایە کە ئیسلام لە شێوازی حکومەتدا بونیادی شوورا دەخاتەڕوو. کە لە هەر لایەکەوە لەگەڵ دیموکراسیی ڕۆژئاوادا جیاوازە، لە هەر ڕوویەکەوە ڕۆچووتر و فراوانترە.

دکتۆر (حسن عبدالله ترابي) پێشەوای ئیسلامگەراکانی سودان، لە پەرتووکی (نظرات في الفقه السياسي)، د. عبدالحميد الأنصاري (الشورى وأثرها في الديمقراطية)، ئەم لایەنخوازییەیان وەرگرتووە.

**سێهەم:** لایەنخوازییەك کە بە ڕەخنە و گومان دروستکردن لەسەر دیموکراسیی رۆژئاواوە خەریك دەبێت و چاو دەخاتە سەر سیاسەتی دوو لایەنەی ڕۆژئاواییەکان لە هەڵسوکەوت کردنیان لەگەڵ مەسەلە جیهانییەکاندا. کە دیموکراسی لە وڵاتەکانی بەدەر لە هەسارەی ڕۆژئاوا، نادرەوشێننەوە و هیچ جۆرە پابەندییەکیان سەبارەت بە بونیاد و ئامانجەکانی دیموکراسی لە کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتیدا نییە.

لە دەستەی ئەوانە دەتوانرێت ئاماژە بە ( خالد محمد خالد) نووسەری (الديمقراطية، ابداً)، (محمد قطب) لە (مذاهب فكرية معاصرة)، بە ڕووماڵی کردن دژی دیموکراسی رۆژئاواوە خەریك دەبن.

**چوارەم:** لایەنخوازیی ئەوانەی کە لە بونیادەوە دیموکراسی بە دژ دەزانن لەگەڵ ئیسلام و بنەماکانی ئیسلامدا. هەر جۆرە لێکچوون و هاوڕابوونێکی دیموکراسی لەگەڵ ئیسلامدا، یاخود پابەندبوون بە دیموکراسییەوە، بەرهەڵستی دەکەن.

ئەم لایەنخوازییە بە تایبەت لە نێوان نووسەرانی لایەنخواز بە فکرەی (سەلەفی و حزبی تەحریری ئیسلامی لە میصر و جەزائیر و وڵاتانی عەرەبی، هەروەها لە نێوان فەقیهەکانی مەزهەبی ئیمامی سەید کازم حائیری خاوەنی پەرتووکی (أساس الحكومة الاسلامية)دا، هەیە.[1]

پەیوەندیی دین و دونیا یەکێکی ترە لەو بابەتە گەرم و گرنگانەی بە بۆچوونی فەقیهەکانی سەردەمی نوێ، زۆرینەی نزیك بە یەکبوونی فەقیهەکان، بیرمەندان، نووسەرانی موسڵمان، دین و دونیا، شەریعەت و حکومەت، بە دوو کاری پەیوەست بە یەك و پەیوەندیی نێوان ئەو دوانەیە بە ـ حەتمی ـ پێویست و ـ لۆژیکی دەزانن، چونکە بۆچوون و تێگەشتنی هەر فەقیهێك لە دینی ئیسلام ئەوەیە کە بەبێ حکومەت و بەرپرسیارێتی لە کۆمەڵگادا، ناتوانێت پەیامی خۆی و کاری کۆتایی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێت. چونکە یەکەمین ئەزموونی مێژوویی دینی ئیسلام، ئەزموونێکی سیاسیی حکومەتی بووە، بە درێژای مێژوو هەر دەسەڵات و حکومەتێك لە بونیادەکانی ئیسلام ڕەوابوونی خۆی بەدەستهێناوە. جگە لەوەی کە زۆربەی ئەحکامی ئیسلامی لە حاڵەتێکدا جێبەجێ دەکرێن کە حکومەتێکی پابەند بە ئەنجامدانی ئەحکامی ئیسلامی دەسەڵات بگرێتە دەست. شایەتی زیندووی ئەم پەیوەستبوونە لە ڕەوتی ڕیفۆرمخوازانە و ڕاپەڕینەکانی خەڵکی موسڵمان لە سەردەمی نوێدا دەدۆزینەوە، کە هەموو بە ئیلهام وەرگرتن لە بنەما و بیروباوەڕە مەزهەبییەکان و بە ڕابەرایەتیی فەقیهانی بەناوبانگ و بیرئازاد، خراونەتە بواری جێبەجێکردنەوە. ئێمە لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامدا ڕاپەڕینێك نابینین کە ڕابەرەکەی لە قورئان و حەدیس سوودی وەرنەگرتبێت. بزووتنەوە ئازادیخوازەکانی جیهانی ئیسلام و ڕابەرە رۆحییەکانیان زۆربەیان ئاڕاستەکاری مەزهەبی و شەرعییان بۆ خود و بۆ ڕاپەڕینەکانیان هەبووە و ئەگەر وەها نەبوایە نەیاندەتوانی

---

١- زكي الميلاد، الفكر الاسلامي، قراءات و مراجعات، ص٤٨-٤٦- مؤسسة الانتشار العربي، لندن، بيروت، ١٩٩٨.

توێژە جیاوازەکانی خەڵك بۆ بەرگری و ململانێ و جیهاد و شەهادەت، بانگهێشت بکەن و ڕاپەڕێنن.

بەم شێوەیە فەقیهەکان چ لە پێگەی دەسەڵاتدا بن، کە بێگومان لەسەریانە ئیجتهادی نوێ بەدەست بهێنن، تاکو بتوانن حکومەتی سەردەمی مۆدێرنیتە و دوای مۆدێرنیتە لەسەر بنەمای شەریعەت ڕێك بخەن، بە پراکتیکی حکومەتی ئیسلامی دروست بکەن، چ لە پێگەی خەبات کردندا بن، کە دەبێت شێوازی لێهاتووانە و ڕێگەپێدراو بۆ ڕوهێنانی خەباتگێڕان بخاتەڕوو.

ئەمڕۆکە داکەوتەی ژیان بە شێوەیەکی بەرچاوگیر گۆڕاوە، چاوەڕوانییەکانی مرۆڤ لە دین– لە زانست – لە حکومەت – لە کۆمەڵگا– بە گشتی گۆڕاوە. شارەکان گەورەتر– خێزانەکان بچووکتر– پسپۆڕییەکان هەمە جۆرتر– بوون، بە کورتی ژیان بە تەواوی گۆڕاوە.

گەلەکان لە کێبڕکێیەکی نەبینراودا لە لایەنە شارستانی و حکومییەکاندا، کەوتوونەتە جموجوڵ. ڕێکخراوە جیهانی و ناوچەییەکان– بەڵێنە ئابووری و نیزامییەکان، هاوکارییە زانستی و کولتوورییەکان، شێوازی هەنوکەیی دونیای نوێ پێکدەهێنن، بە جۆرێك کە نەخشەی سیاسیی جیهان نەخشەیەکە جیاواز لە سەردەمی ماوەردییەکان، ئیبن خەلدونەکان، نەوەوییەکان و غەزالییەکان.

لە وتاری پەرتووکەکاندا ئاماژەی پێکراوە، لە سەردەمەکانی ڕابردوودا دونیا ئەوەندە ئاڵۆز نەبوو، ئەوەندە فراوان نەبوو، کە ئەمڕۆکە چەندین کارناس و پسپۆڕ تەنها بە یەك لایەن لە لایەنەکان گرنگی دەدەن و چەندین وەزارەتی تایبەت بۆ کاروبار و بەشە چالاکەکان لە کۆمەڵگادا، دامەزرێنراون.

کەوایە فیقه چووەتە قۆناغێکی نوێوە کە فەقیهەکان ناچار دەکات دووبارە چاوبخشێننەوە بە شتەکان و چەسپاندنی بنەما و یاساکان بەسەر بەشەکاندا. هەندێك جار پرسگەلێك دێنە پێش کە لە سەردەمی فەقیهەکانی مەزهەبدا نەخراونەتە ڕوو و بۆ یەکەمجار لەم قوناغەدا دەخرێنە ڕوو و دەکەونە ژێر پرسیارەوە.

وەك نموونە دەتوانین بە دوو مەسەلەی نوێ لە بەشەكانی مامەڵەی بازرگانی و بانك، ئاماژە بدەین، كە لە میانەی سەدەی بیستدا لە میصر خرایە ڕوو و شێخی ئەزهەری ئەوكاتە (شيخ محمود شلتوت) لەبارەی ئەوانەوە پەنای بردە بەر ئیجتهادی نوێ.

**یەكەم:** تایبەت بە سودەكانی سندوقی پاشەكەوت:

ئایا ڕەوایە لە ڕووی شەرعییەوە كە موسڵمانان پشكی خۆیان لە سندوقەكانی پاشەكەوت وەربگرن؟

وەڵامی شێخ بەم شێوەیە بووە كە لە چاپی شەشەمی پەرتووكی (الفتاوى) هاتووە: هەندێك لە زانایان ئەو سودەی كە فەرمانگەی گەیاندن بە سەرمایەگوزاران لە سندوقی پاشەكەوتدا دەیدات، بە حەرامی دەزانن، بە بەڵگەی ئەوەی كە ئەم سودانە یان سودی (ڕیبایی) پارەی پاشەكەوت كراون، یان قازانجێكە كە لە ڕێگەی قەرزەوە بەدەست هاتووە، كەوایە لە هەردوو حاڵەكەدا حەرامە بە پێی یاسای شەریعەتی ئیسلام، لەبەر ئەوە دەبێت بدرێتەوە و وەرگرتن و سودكردن پێوەی حەرامە. بەڵام بە بۆچوونی ئێمە بە سەرنجدان لە ئەحكامی شەرعی و یاسا فیقهییەكان، حەڵاڵە و حەرامیی تێدا نییە، بەو بەڵگەیەی ئەو بڕەی كە باسمان كرد خاوەنەكەی وەك قەرز نەیداوەتە سندوقی پاشەكەوت، سندقی پاشەكەوتیش ئەم بڕەی وەك قەرز وەرنەگرتووە، بەڵكو خاوەنەكەی بە حەز و هەڵبژاردنی خۆی سپاردوویەتی بەو فەرمانگەیە. لە حاڵێكدا دەزانێت ئەو فەرمانگەیە ئەم بڕە پارەیە بەكاردەهێنێت بۆ پرۆژە بازرگانییە هەمەجۆرەكان كە زیان تێیاندا زۆر كەمە، مەبەستی ئەو لە پاشەكەوت، یەكەم: خۆڕاهێنانە لەسەر كەم خەرجكردن و پاشەكەوت كردن. دووەم: یارمەتیدانی ئەو فەرمانگەیە بۆ زیادكردنی سەرمایەكانی، تاكو بتوانێت سنووری مامەڵەكانی زیاتر بكات.

كەوایە ئەم دوو مەبەستە دوو نیەتی پڕخێر و بەرەكەتن، ئەو كەسەی كە ئەمە دەكات پێویستە هانبدرێت و ڕێزی لێ بگیرێت.

ئەگەر فەرمانگە بۆ هاندان و بە مەبەستی ڕێز لێگرتن لەم كەسانە، ساڵانە بڕێك پارە بە هەر سەبارەتێك كە دەیەوێت، بیداتە كەسی پاشەكەوتكار، بێگومان مامەڵەیەكی لەم

جۆره لەخۆگری سوودی گشتییه بۆ خاوەن پارەو حکومەتیش، هەروەها بە هۆی ئەمەوە هیچ ستەمێك بە کەس ناگات و نیازمەندبوونی هیچ کەسێك خراپ کەڵکی لێ وەرناگیرێت.

هەڵبەتە ئەم مامەڵەیە بە ڕیزبەندی کردنی لە یەکێك لەو کۆمپانیایانەی کە فەقیهەکان ئاشنای بوون و دەربارەی ئەحکامەکانی باسیان کردووە، شایانی چارەسەر نییە، چونکە ئەم مامەڵەیە بۆ فەقیهە پێشووەکان نەناسراو بووە، بە تایبەت کە پێشکەوتنی مرۆیی لە کاروباری ئابووری– گرێبەستەکان– کۆمەڵێك ڕووداوی هێناوەتە ئارا لەسەر بنەمای بونیادی ڕاست، کە پێشتر نەناسراوبووە و نائاشنا. چونکە میلاکی شەرعی بۆ حەڵاڵ یان حەرامبوونی هەر مامەڵەیەك لە قورئاندا ئەوەیە (والله یعلم المفسد من المصلح) واتا خوداوەند خراپەکار جیادەکاتەوە لە چاکەکار. ئەمەی کە (لا تظلمون ولا تظلمون) واتا نە ستەم بکەن لە کەس و نە کەس ستەمتان لێ بکات. کەواتە بۆچی ئێمە ئەم میلاکە دانەنێین بۆ داوەری و بۆچی بە خواستی ئەمە بەرەوپێش نەچین؟[1] کەوایە ئاشکرا دەبێت کە سوودی باسکراو نە سوودی ڕیبایە، نە سوودێکە کە لە پێدانی قەرزەوە بەدەست بێت، بە گریمانەی ئەوەی کە حەدیسێك لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێبێت) ڕیوایەت کرابێت کە (کل قرض جر نفعا فهو ربا) و لە ڕووی سەنەدیشەوە (صحیح) بێت.[2]

شێخ شەلتوت بەم فتوایە دژایەتیی فەقیهە موحافیزکارەکانی جیهانی عەرەب، بەتایبەت میسری ڕووبەڕووی خۆی کردەوە، بەڵام ئەو ئەم هەڵوێستانەی نادیدە گرت و فتواکانی تری تایبەت بە بابەتە نوێیەکانی تری وەك (پشك– مستندات– سودەکانی کۆمپانیا هەرەوەزییەکان) دەرکرد، چونکە ئەو بڕوای وەهابوو (دەرهێنانی ئەم جۆرە

---

١- الشيخ محمود شلتوت، الفتاوى-دراسة لمشكلات المسلم المعاصر في حياته اليومية والعامة)، چاپی شەشەم، دار الشروق – بيروت-١٩٧٢، ص٣٥١.

٢ – بگەڕێنەوە بۆ: د. عبدالمنعم احمد النمر، زانستی فیقه، ل١٨١-١٧٩. ئەم حەدیسە هەر چەند شایەتێکی لاوازی لە (فضالة بن عبيد) لەلای بەیهەقییەوە هەیە، بەڵام ئەوەندە هێزی نییە کە بنەمای یاسای گشتیی لە فقهی مامەڵەکاندا بێت.

مەسەلانە لەسەر بنەمای ئەو مامەڵانەی کە لە پەرتووکە کلاسیکییە فیقهییەکاندا هاتووە، کارێکی ڕاست نییە، بەو بەڵگەیەی کە مامەڵەکانی لەم جۆرە دەسکەوتی کەسانێکە کە لە بەشی ئابووری و سەرمایەگوزاریدا گەشتوونەتە پلەی پسپۆڕی و بۆ فەقیهە پێشینەکان نەناسراو بووە.[1]

**دووەم:** بابەتی بیمە:

بابەتێکی تر لە بابەتەکانی فیقهی نوێ، کە فەقیهەکانی ئاینزا لێی بێئاگابوون، بابەتی بیمەیە، کە ئەمڕۆ بە ناونیشانی بەشێکی گرنگی پێدراو لە چالاکییە ئابووری و حکومییەکاندا بەکارهاتووە، کۆمپانیای جۆراوجۆر زۆر لە چالاکی و بڵاوبوونەوەیدا هەوڵدەدەن و پیشەیەکە کە سەرەتا لە سەدەی سێزدەی کۆچی و نۆزدەی میلادییەوە لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات هات. یەکەمین فەقیهە کە لە بارەیەوە توێژینەوەی لەسەر کرد، زانا و فەقیهی دواینی حەنەفییەکان (محمد بن عابدين) (١٢٥٢–١١٩٨) کۆچی، خاوەن (رد المحتار على الدر المختار) بوو، کە ناوی نا (عقد السوكرة)، گوتی (لزوم ما لا يلزم)ە، کەوایە گرێبەستێکە بەتاڵ، کە هەڵبەت بۆچوونی خۆی لەسەر بنەمای کاروبار و کۆمەڵێك دانان دەربڕی بوو کە هەموویان لە ئێستادا بۆ ئەهلی بیمە یەکلایی نییە.

فتوای ئەویش ناتوانرێت بە قسەی کۆتایی لە بابەتەکەدا هەژمار بکرێت، چونکە لەوانەیە لەبارەیەوە جارێکی تر ئیجتهاد بکرێت تێیدا.[2]

لە ڕاستیدا فتوای ئەو دەبێت بە یەکەمین هەڵسوکەوتی یەك فەقیهی موسڵمان لەگەڵ مەسەلەی بیمەدا لەبەرچاو بگیرێت. کە پاش ئەو فەقیهەکانی تر، وەك (شيخ محمد بخيت مطيعي) و (شيخ عبدالرحمن قراعة مفتي) دەربارەی بیمە فتوایان داوە، تا ئەندازەیەك هەمان ڕێگای ئیبن عابدینیان لە ڕاوەستاندنیدا درێژە پێداوە، تا ئەو کات لە کۆنگرەی هەفتەی فیقهی ئیسلامی کە لە ١٥–٢٠– شەوال ١٣٨٠ لە دیمەشق گیرا، جارێکی تر

---

١ - د. عبدالمنعم النمر- سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٧-١٨١.

٢ - عبدالمنعم النمر- سەرچاوەی پیشوو، ل١٨٨-١٨٧.

بابەتی بیمە لە بۆچوونی شەریعەتی ئیسلامییەوە کەوتە لایەنی باسکردنەوە، زانایانی بەشداربوو لە بەرامبەریدا بوونە دوو گرووپ:

١ـ گرووپێکیان بە توندی پێچەوانەی شەریعەتیان لەبەر چاوگرت، کە وەك هەمیشە زانایانی پەیوەست بە فیقهی کلاسیکییەوە بوون.

٢ـ گرووپێك کە بەپێی بەڵگە و لۆژیك و ئیجتهاد وەریانگرت و لایەنگیرییان لێکردووە، لە سەرووی هەموویانەوە (د. مصطفى الزرقاء) مامۆستای زانکۆ لە بەشی مافی شارستانی و شەریعەتی ئیسلامی. کە پەرتووکێکی تایبەت بەوە داناوە و لەسەر مۆڵەت پێدانی بیمە بەڵگەسازیی کرد.[١]

بابەتی بیمە لەم سنوورەدا ڕانەوەستاوە، ئەم جارەیان لە چوارچێوەی (الازهر)دا لەلایەن ئوستاد (شیخ علي خفيف) هێنرایە نێو کۆڕی باسەوە، ئەو لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە پێشکەشی کۆمەڵەی توێژینەوەکانی کرد، گەشتە ئەو ئەنجامەی کە بیمە لە ڕووی شەرعییەوە ڕێگە پێدراوە، هیچ کەموکوورییەکی تێدا نییە، هەڵبەت ئەم باسە یەکێکە لە بابەتە گەرموگوڕەکانی ئەم سەردەمە بوو.[٢]

جگە لەوەی مەزهەبەکانی ئەهلی سوننەت هەرچواریان لە بابەتی تیۆری گرێبەستەکاندا، بینەری کامڵبوون و نوێبوونەوەیەکی بەرچاویگربوون. بە واتایەکی تر کە ئاینزاکان (حنفي- شافعي- حنبلي-مالكي) هاوڕا لەگەڵ هەلومەرجی شوێن و کات، بۆچوونی پیشکەوتووانەیان خستووەتەڕوو و تەواویان کردووە. ئەم کارە لە مەیدانی فیقهدا ئەنجامی سروشتیی کامڵبوونی زانستی ئوصولە لای ئەوان.

بونیادی بە باشزانی (استحسان) لە بونیادی فیقهی حەنەفیدا بووەتە هۆی ئەوەی کە زۆرێك لە کێشە پراکتیکییەکانی ڕۆژ لە کۆمەڵگادا چارەسەر بێت و لە کاروباری مامەڵەکاندا ئاسانکارییەك کە جێی سەرنج بێت، لەبەرچاو بگرێت.

---

١ - سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٨.

٢ - د. عبد المنعم النمر، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٩.

وەکو نموونە، دەتوانرێت ئاماژە بە کامڵبوونی فیقهی حەنەفی، تایبەت بە مەرجەکانی ناو گرێبەست، بکرێت.[1]

بەم شێوەیە فەقیهە حەنەفییەکان وەك بنەمایەکی گشتی، یەکبوونی مامەڵە بە واجب دادەنێن، لەگەڵ ئەمەشدا ئیستیسنای زۆریان لەم بنەمایە کردووە، کە ڕێگە بۆ فراوانبوون و کامڵبوونی بۆچوونە فیقهییەکان ئاسان دەکات و ئەوان مەرجەکان بەم جۆرە پلەبەندی دەکەن:

١- ئەو مەرجانەی کە خودی گرێبەستەکە دەیخوازێ.

٢- ئەو مەرجانەی کە گونجاوە لەگەڵ گرێبەستەکەدا.

٣- ئەو مەرجانەی کە نەخوازاراوی گرێبەستەکەن و نەگونجاون لەگەڵیدا، بەڵکو لەخۆگری بەرژەوەندییەکن.

٤- ئەو مەرجانەی کە هیچ بەرژەوەندییەکیان تێدا نییە، بەڵام گرێبەستەکە ناگۆڕێت بۆ دوو مامەڵە.

٥- مەرجی فاسد (باطل) مەرجێکە کە گرێبەستەکە دەگۆڕێت بۆ دوو مامەڵە.[2]

مەزهەبی شافیعی لەم خاڵەدا لێکچوونی زۆری هەیە لەگەڵ مەزهەبی حەنەفیدا. بەو جیاوازییەی کە مەرجی گونجاو نەك لە ڕووی ئیستیسناوە، بەڵکو لە ڕووی بنەمای سەربەخۆوە وەری دەگرێت و مەرجی گونجاو و مەرجی ناسراو بە یەکێك دەزانێت.

مەرجێك کە هیچ جۆرە مەبەست و سودێکی تێدا نییە، هەڵوەشاوەیە.

---

١- دیارە کە حەقیقەتی مەرجدارکراو (مشروط) لەسەر ئەو، واتە مەرج (شرط) وەستاوە، بەڵام بوونی ئەو پێویست ناکات، واتا فەرزبوونی مەرج لە بوونی کاریگەریی نییە. بە دەربڕینێکی تر، مەرج کارێکە لە دەرەوەی حەقیقەتی مەرجدارکراوە کە لە نەبوونی ئەو، نەبوونی مەرجدارکراو پێویستە و لە بوونی ئەو، بوونی مەرجدارکراو پێویست نابێت، بۆ نموونە بوونی هەردوو هاوسەر لە ڕوودانی تەڵاقدا.

فیض - مبادیء اصول الفقه، ص١١٥-١١٤.

٢- عبدالرزاق السنهوري، مصادر الحق فی الفقة الاسلامي، ج٣، ص١٥٣-١٥١.

بەڵام گرێبەست هەر وەك خۆی دروست هەژمار دەكرێت. بنەمای گشتی بەناوبانگ لە فیقهی شافیعیدا ئەوەیە كە فرۆشتنی مەرجدار بە ڕەوا دانانێت، واتا فرۆشتنێك كە مەرجدارە بە سودێكەوە كە نەخوازراوی گرێبەستەكەیە و نەگونجاوە لەگەڵیدا.[1]

وەك نموونە لە (مهذب)ی شیرازیدا هاتووە.

ئەگەر مەرجێك لە فرۆشتندا لەبەرچاو بگرێت، سەیر دەكەیت ببینیت ئەگەر خوازراوی گرێبەستەكە بوو وەك (تسلیم[2]– رد[3]) لەبەر كەموكووڕیی ئەو شتانە، گرێبەستەكە بەتاڵ نابێتەوە، چونكە ئەم مەرجە ڕوونكەرەوەی ئەوەیە كە گرێبەستەكە دەیخوازێ. لەبەر ئەوە بەتاڵی ناكاتەوە. پاشان ئەگەر شتێك بكاتە مەرج – كە خوازراوی گرێبەستەكە نییە، بەڵام بەرژەوەندییەكی تێدایە، وەكو (خیار– اجل – رهن– تضمین) لەم شێوەدا گرێبەستەكە بەتاڵ نییە، چونكە شەرع هێناویەتی و كەسی پێویست خوازیاریەتی. كەوایە گرێبەستەكە بەتاڵ نابێتەوە، ئەگەر مەرج بكات كە كۆیلەی فرۆشراو ئازاد بكات، ئەو كاتەش گرێبەستەكە بەتاڵ نابێتەوە، چونكە عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) كۆیلەیەكی كڕی تاكو ئازادی بكات، بەڵام خاوەنەكانی ویستیان خاوەندارێتی بكەنە مەرج، حەزرەت فەرمووی بە عائیشە: بیكڕە و ئازادی بكە. خاوەندارێتی مافی كەسێكە كە ئازادی دەكات، بەڵام ئەگەر جگە لەم مەرجە مەرجێك دابنێت كە نەگونجاویی لەگەڵ خوازراوی گرێبەستەكەدا هەبێت، بۆ نموونە كۆیلەیەك بفرۆشێت بەو مەرجەی خۆی نەفرۆشرێت و ئازاد نەكرێت، یاخود خانوو بفرۆشێت بەو مەرجەی كە ماوەیەك خۆی تێیدا بمێنێتەوە، یاخود پارچەیەك بە كەسێك بفرۆشێت بەو مەرجەی بۆ خودی ئەوی بدوورێت، یان پێستەیەك بفرۆشێت بەو مەرجەی كە پێڵاوی لێ دروست بكات بۆی، لە هەموویاندا فرۆشتنەكە بەتاڵە، بەو بەڵگەیەی كە لە پێغەمبەرەوە

---

١- د. السنهوري، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٥٢,

٢- تسلیم/ دانەدەس.

٣- رد/ گێڕانەوە.

(دروودی خوای لێبێت) ڕیوایەتکراوە کە (نهى عن بيع وشرط) نەهی کردووە لە فرۆشێنێك کە مەرجی لەگەڵدابێت و ڕیوایەتکراوە کە (عبدالله بن مسعود) (ڕەزای خوای لێبێت) کەنیزەکێکی لە هاوسەرەکەی (زينب ثقفي) کڕی بەو مەرجەی کە ئەگەر بیفرۆشێت بە هەمان نرخ ماڵی خودی زەینەب بێت. کاتێك ئیبن مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت) پرسیاری لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کرد، لە وەڵامدا پێی گوت: لەگەڵ ئەو کەنیزەکەدا نزیکی مەکە، چونکە تێیدا مەرجێك هەیە بۆ کەسێکی تر.[1]

لەم بابەتەدا ئاینزای مالیکی لەپێشترە لە هەردوو ئاینزای حەنەفی و شافیعی، واتا جگە لەو مەرجانەی کە حەنەفی و شافیعییەکان لە گرێبەستەکاندا وەریانگرتووە، مەرجی تریان بە ڕەوا داناوە. بە بۆچوونی مالیکییەکان ئەساس ئەوەیە کە هەر مەرجێك دروست بێت، گرێبەستەکەشی دروست دەبێت، مەگەر ئەوەی کە مەرجێك بە ئیستیسنا بە بەتاڵ بناسرێت.

لەبەر ئەوەیە چەمکی مەرج لە ئاینزای مالیکیدا زۆر فراوانترە لەو چەمکە لە ئاینزای ئەبو حەنیفەدا. لە هەردوو مەزهەبەکەدا مەرجێك خوازراوی گرێبەستەکە بێت یاخود گونجاوبێت لەگەڵیدا، یان وەکو باو لە مامەڵەکەدا هەبێت، ڕاستە. دەمێنێتەوە مەرجێك لەخۆگری بەرژەوەندییەکی ڕێگەپێدراوە، کە نەخوازراوی گرێبەستەکەیە و نەگونجاوە لەگەڵیدا، ئەم مەرجە بە بۆچوونی مالیکی ڕاستە، بەڵام لای ئەبو حەنیفە بەتاڵە.

مەرجی باتڵ (ناڕەوا) بەپێی ئاینزای مالیکی تەنها لە دوو حاڵەتدا دەبێت:

١ـ مەرجێك دژایەتیی لەگەڵ خوازراوی گرێبەستەکەدا هەبێت. بۆ نموونە ئەگەر فرۆشیار مەرجی ئەوە لەسەر کڕیار دابنێت کە لە فرۆشراوەکەدا هیچ هەڵسوکەوتێك نەکات، یاخود پیاو لەسەر ژن مەرج دابنێت کە بژێویی نەداتێ و میراتی لێ نەبات.

٢ـ مەرجێك کە نرخەکەی کەموکورتیی تێدا بێت. وەك فرۆشتنێك کە لەخۆگری قەرز بێت، وەکو فرۆشتنی (ثنيا)، واتە کەسێك شتێك بکڕێت بەو مەرجەی هەر کاتێك

---

١- ابو اسحاق الشيرازي، المهذب، ج١، ص٢٧٥، النووي، المجموع شرح المهذب، ج٩، ص٣٦٧.

فرۆشیارەکە نرخەکەی گەڕاندەوە، کەلوپەلەکە دەبێتەوە بەماڵی (کە هەڵبەت ئەم مامەڵەیە لە یاسای نوێدا هەمان (بیع الوفاء) ناویەتی، فرۆشتنێکە پەیوەستە بەو مەرجەوە نەفرۆشتنێك هاوڕا لەگەڵ مەرجدا) نموونەی ئەوە کە فرۆشیارەکە مەرج بکات بە کڕیارەکە هەرکات کڕدراوەکەی فرۆشت، فرۆشیارەکە بە هەمان نرخی یەکەم دووبارە بیکڕێتەوە و لەوانی تر لەپێشتر بێت.

بێگومان هۆکاری بەتاڵبوونی ئەم جۆرە مەرجە ئەوەیە کە تەنها سوودی کڕیار یان فرۆشیاری تێدا لەبەرچاو گیراوە، کەمی و زۆریی نرخ چ لە (بیع الثنیا) چ لە فرۆشتنی مەرجداردا، نەزانراوە، بە ئەندازەیەکی زانراو نییە.

بەم جۆرە مەرجی بەتاڵ لە هەموو حاڵەکاندا بەتاڵە و کاری پێناکرێت و کاریگەریی بەسەر گرێبەستەکەوە بەم جۆرەی خوارەوەیە:

١- مەرجێك کە دژی خوازراوی گرێبەستەکەیە، خۆی بەتاڵ و گرێبەستەکە بەتاڵ دەکاتەوە.

٢- مەرجێك کە دژ بە خوازراوی گرێبەستەکەیە، بەڵام لە حاڵەتی بەکارهێنانیدا، کەموکووڕی ناگەیەنێت بە گرێبەستەکە، خۆی لەناو دەچێت، بەڵام گرێبەستەکە بە بەهێزیی خۆی دەمێنێتەوە. بۆ نموونە گەر ژنێك مەرج دابنێت بۆ پیاوەکەی کە بە هەبوونی ئەم ژنێکی تر نەهێنێت، یاخود تەڵاقی نەدات، یاخود لە شاری خۆی نەیبات بۆ شارێکی تر.

٣- مەرجێك کە نرخەکە دەگۆڕێت، خۆی لەناوچووە، بەڵام مانەوەی گرێبەستەکە پەیوەستە بەوەوە کە مەرجەکە دەکات، مەرجەکەی لەبەرچاو نەگرێت و لێی خۆشبێت، وەکو فرۆشتنی مەرجدار.

تێبینی دەکرێت لەم بابەتەدا مەزهەبی مالیکی هەنگاوێك لەپێشترە لە هەردوو مەزهەبی حەنەفی و شافیعی، بەو بەڵگەیەی بە پێچەوانەی هەردوو مەزهەبەکەوە، مەزهەبی مالیکی مەرجدارکردنی هەر جۆرە بەرژەوەندییەکی مەبەستداری بە ڕەوا

داناوه[1] بەم حاڵەوە چەمکی مەرج هاوڕا لەگەڵ گرێبەستەکەدا لە فیقهی مالیکیدا وەها کۆت و بەندێکی هەیە کە فەقیهەکانی مالیکی نەیاتوانیوە بەگشتی ڕەهابن لێیان. ئەم کارە گرنگەیان سپاردووە بە زانایانی مەزهەبی حەنبەلی، بە تایبەتی لە شێوازی تەواوکردنی ئەم مەزهەبەدا کە (ابن تيمية الحراني) بە ناونیشانی یەکێك لە گەورەترین موجتەهیدەکانی ئەو، خستویەتییە ڕوو.

حەنبەلییەکان وەکو مالیکییەکان، ئەساسی مەرجەکانیان لەسەر ئەوە داناوە کە هەر مەرجێك دروستە مەگەر کە بە ئیستیسناء بە بەتاڵ بناسرێت. مەرجی بەتاڵ ئەوەیە کە دژایەتیی لەگەڵ خوازراوی گرێبەستەکەدا هەبێت، یان لەبارەیەوە دەقێکی تایبەت هەبێت کە بەڵگە بێت لەسەر قەدەغەبوونی.

بەپێی مەزهەبی حەنبەلی، مەرجی هاوڕا، گونجاو و دەستەبەرکەری بەرژەوەندییە و هەتا مەرجێك کە لەناو فرۆشتنەکەدا باس دەکرێت، هەموو ڕاستە و بۆ ڕاستبوونی پێویستی بەوە نییە کە ناسراو بێت. لە گرێبەستی هاوسەرگیریدا بە جۆرێك ڕازین بە فراوانیی مەرجەکان کە هەر جۆرە مەرجێك کە بۆ یەکێك لەو دوو لایەنە بەرژەوەندییەك لەخۆ بگرێت، ڕەوایە و وەفاکردن پێی بە پێویست دەزانن.

لەم بارەشەوە پشت دەبەستن بە حەدیسێك کە لە صەحیحەیندا هاتووە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) دەفەرموێت (شایستەترین مەرجێك کە دەبێت وەفایان پێ بکەین، ئەو مەرجانەن کە هۆکاری حەڵاڵبوونی شەرمگەن (فرج)) بە پێی ئەم مەرجە تەنها لە دوو هەڵوێستدا بەتاڵ هەژماردەکرێت:

١ـ ئەو مەرجەی لەگەڵ خوازراوی گرێبەستەکەدا لە دژایەتیدا بێت.

٢ـ ئەوەی دەقێکی تایبەت نەهیی لێکردبێت.

تا ئێرە ئاینزای حەنبەلی نزیك بە ئاینزای مالیکی بەرەو پێش چووە، شتێکی نوێی نەهێناوەتە ئاراوە، بەڵام لەم مەزهەبەدا فتواکانی (ابن تيمية) و ئەو تێگەیشتنانەی کە

---

١ـ د. السنهوري ـ مصادر الحق، ج٣، ل١٥٥بەدواوە.

ئەو لەسەر مەزهەب کردوویەتی، بە جێگەیەك گەیشتووە کە هەموو مەرجێك بە ڕەوا و ڕاست وەردەگرێت، لە حاڵەتێکدا نەبێت کە ئەو مەرجە دژایەتی لەگەڵ بنەما و مەبەستەکانی گرێبەستەکەدا هەبێت، یاخود حەرامێك حەڵاڵ بکات. (ابن تیمیة) لە بنەڕەتەوە تاك بوونی مامەڵە (وحدة الصفقة)[1] دووردەخاتەوە و بازنەی مەرجە بەتاڵەکان تا ئەو جێگەی کە دەستبدات، بچووك دەکاتەوە.

دەتوانین بڵێین کە: مەزهەبی حەنبەلی لەلایەن (ابن تیمیة)وە بە ئەندازەیەك بابەتی مەرجی برەو پێ داوە کە بە گشتی لە زاراوەی زۆر کۆنی یەکتایی مامەڵە دوورکەوتووەتەوە و گەیشتووەتە خاڵێك لە پێشکەوتن کە یاسای شارستانیی نوێ لە ڕۆژئاوادا، پاش بڕینی چەندین قۆناغ پێی گەیشتووە.

ئەم نوێبوونەوە و گونجاوییە لە فیقهدا، چووەتە نێو نووسراوی ئەحکامە دادوەرییەکانی حکومەتی عوسمانی و هەم چووەتە نێو مافی شارستانیی عێراقەوە.

لە ماددەی ١٣٠ی یاسای شارستانیی عێرقدا هاتووە:

١ـ ڕەوایە کە گرێبەستەکە هاوڕابێت لەگەڵ مەرجێکدا کە خوازراوییەکەی ئەوە دووپات دەکاتەوە، یان گونجاوە لەگەڵیدا، یان باوبێت بەپێی دابونەریت.

٢ـ هەروەها ڕەوایە کە گرێبەستەکە هاوڕای مەرجێك بێت کە تێیدا بەرژەوەندی بۆ هەردوو لایەنی گرێبەستەکە، یان یەکێکیانی تێدا بێت، بە مەرجێك کە ئەو مەرجە لە ڕوویی یاساییەوە قەدەغە نەبێت، یاخود پێچەوانەی دەستوور و نەریتی گشتی نەبێت، ئەگەرنا مەرجەکە هەڵوەشاوەیە، بەڵام گرێبەستەکە ڕاست دەبێت.

لە حاڵەتێکدا ئەگەر مەرجەکە هاندەری گرێبەستەکە نەبوو، ئەوا لەم حاڵەدا گرێبەستەکەش بەتاڵ دەبێت.[2]

لە فیقهی ئیمامییەدا مەرجی هاوڕا لەگەڵ گرێبەستەکەدا چوار جۆرە:

---

١- یەك مامەڵەیی.

٢- د. السنهوري، منبع سابق، ج٣، ص١٧٦ـ١٦١.

١ـ مەرجێك كە هاوڕایە لەگەڵ خوازراوی گرێبەستەكەدا و دووپاتی دەكاتەوە، وەكو مەرجی (تسلیم بیع، خیار مجلس، تقابض) ئەمجۆرە مەرجانە كاریگەرییان لەسەر گرێبەستەكە نابێت.

٢ـ مەرجێك كە خوازراوی گرێبەستەكە نییە، بەڵام بەرژەوەندیی دوو لایەنەی گرێبەستەكەی تێدایە، ئەم بەرژەوەندییەیان پەیوەندیی بە نرخەوەیە. وەكو مەرجەكانی (ماوە ـ رهن وضمان)، یان پەیوەستە بە كاڵاوە، وەكو مەرجی گرتنی پیشەی مەبەست لە كاڵاكەدا، وەك (پیشە ـ نووسین ـ كویلە)، یان پەیوەندیی بە بەربەستێكەوە هەیە، وەك (خیار)، ئەم مەرجانە گرێبەستەكە باتڵ ناكەنەوە و خودی مەرجەكان ڕاست دەبێت.

٣ـ مەرجێك كە بەرژەوەندیی هیچ كام لەو دوو لایەنەی تێدا نییە.

لە كۆتاییدا بونیادی لەسەر زۆرینە و تەشەنە كردنە، وەكو مەرجی ئازادكردن (عتق) ئەم مەرجە ڕەوایە.

٤ـ مەرجێك نە لەسەر بنەمای زۆرینە و تەشەنەیە و بەرژەوەندیی دوو لایەنی گرێبەستەكەی تێدا نەبووە و خوازراوی گرێبەستەكە نییە.

ئەمە ئەگەر پێچەوانەی شەرع و دژ بە خوازراوی گرێبەستەكە نەبوو، ڕەوایە. بۆ نموونە ئەگەر ماڵێك بە مەرجی دانیشتنەوە بۆ ماوەی ساڵێك تێیدا، بفرۆشێت، یان ئەگەر پێچەوانەی شەرع بوو وەك ئەوەی كەنیزەكێك بە مەرجی سوودلێوەرنەگرتنی كڕیار بفرۆشێت، ئەم مەرجەش بەتاڵ دەبێت.[1]

فیقهی ئیسلامی، بەتایبەت لە زەمینەی مامەڵە دارایی و بازرگانییەكاندا، هەنگاوی گەورەی هەڵگرتووە. لەدێرزەمانەوە ئێمە بینەری كاری ئا لەم جۆرە بووین، لە زەمینەی فیقهی دارایی و ئابووریدا دەبینین سەرەڕای پەرتووكی بەناوبانگی (الأموال)ی (حافظ ابو عبید قاسم بن سلام، المتوفى: ٢٢٤ كۆچی)، كە نزیك ٢٠٠١ حەدیسی ڕیوایەتكراو، وێڕای

١ - علامة حلی، تذكرة الفقهاء، ج١، ص٤٨٩.

تۆماركردنی بەڵگەنامەیی و نووسراوەكان كە لەبارەی كاروبارە داراییەكانی كۆمەڵگا و حكومەتی ئیسلامییەوە كۆیانكردونەتەوە، بەوپەڕی لێهاتووییەوە دابەش و ڕێكی خستوون.[1]

پەرتووكی (الخراج)ی ئەبو یوسف، كە لەسەر داواكاریی (هارون الرشید) نووسیویەتی كە خەلیفەی عەباسییەكان بووە و لەخۆگری ئەحكامەكانی (دەسكەوتەكانی شەڕ- فيء - خراج - أقطاع - كشور - أراض موات) و (دەسكەوتی دەریاكان - هەنگوین - گوێز - بادام - صدقات - باخی خورماكان - ئاوەڕۆكان - لەوەڕگا - چۆنیەتی هەڵسوكەوت لەگەڵ بازرگانانی گەلانی تردا- ئەحكامی هەڵسوكەوت لەگەڵ لەشفرۆشەكاندا - دزەكان - مورتەدەكان - مافی دادوەرەكان - كارمەندان....دەبێت - لە بەشی خۆیدا گوایە لە هەموانی بردووەتەوە.[2]

پاش ئەو (یحیی بن ادم قریشی، متوفی ٣٠٣)، پەرتووكێكی بە ناوی (الخراج) نووسیبوو كە لەبارەی (خواردن "قوت"- فراوانی و باش دابەشكردنی)، بەڵام بە خەراجەكەی ئەبو یوسف ناگاتەوە.[3]

بەڵام ئەویش بە بابەتەكانی وەك (فيء - خراج - حوكمی سەرچاوەكان - روبارەكان - زەكات - بازرگانییەوە خەریك بووە.

پەرتووكی سێهەم لە بابەتی (خراج)دا لەبەردەستدایە كە هەمان پەرتووكی (الاستخراج لاحكام الخراج) فەقیهی زانای حەنبەلی (ابن رجب، متوفی ٧٩٥) كە لایەنی

---

١- ابو عبيد قاسم بن سلام، الاموال، دار الحداثة بيروت، طبعة ١٩٨٩.

٢- ابو يوسف الخراج، چاپكراو لە ناواخنی (في التراث الاقتصادي الاسلامي)، چاپی یەكەم، دار الحداثة، بيروت، ١٩٩٠.

٣- يحى بن ادم قريشى، كتاب الخراج، چاپ كراوە لە ناواخنی (في التراث الاقتصادي الاسلامي)، دار الحداثة، ١٩٩٠.

فیقهی و بەراورد کردنی زیاتری هەیە بەسەر لایەنی گێڕانەوە و لە پەرتووکە پێشووەکان تەکنیکیتر و وردبینانەترە و هەڵگری بۆچوونی زیاترە.[1]

(فقه الزكاة) بەرهەمی ئوستاد (دکتۆر یوسف القرضاوی)یە، کە لەم سەردەمەدا یەکێکە لە پەرتووکە فیقهییەکان کە کۆکراوە و گشتگیرە، بە ڕێگەیەکی داهێنەرانە و لێهاتووانە و زۆر ورد کراوە. خستوویەتیە ژێر باس و توێژینەوە و وردبینییەوە، کە بەرهەمی چەندین ساڵ لە بەدواداچوون و وردکردنەوەی ئەم فەقیهە هزرمەندە میسرییەیە.[2]

کە هەڵبەتە (اقتصادنا)ی ئوستاد (سید محمد باقر صدر)، موجتەهیدی نوێخوازی ئیمامی، بە کاری زۆر گەورە و بەنرخ لە فیقهی ئابووریی ئیسلامیدا هەژمار دەکرێت.

صەدر لەم پەرتووکەدا نەك تەنها بە ناونیشانی فەقیهێکی نوێخواز، بەڵکو وەك بیرمەندێکی ئازاد بیر، بە توێژینەوەی قوتابخانە ئابوورییەکانی هاوچەرخەوە خەریکە و بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوە فیقهییەکانی ئاینزا ئیسلامییەکان، بەتایبەت ئاینزای ئیمامی، نیشانە تایبەتییەکانی ئابووریی ئیسلامی و ئاڕاستەکەی بە باشی دەرخستووە.[3]

ئەو هەروەها پەرتووکێکی لە بانقداریی ئیسلامیدا بە ناوی (البنك اللاربوي في الاسلام) نووسیوە، کە لەم زەمینەیەدا پێشڕەوی ئەو نووسەرانەیە کە پاش ئەو بە لێکۆڵینەوە لەم بابەتەدا خەریك بوون.[4]

فەقیهە موسڵمانەکان جگە لە فیقهی دارایی و ئابووری، لە مەسەلەی بەڕێکردنی کاروباری وڵات و ئەوەی ئەمڕۆ بە چاودێریکردنی نرخ و بازاڕ و فەرمانگە حکومییەکان ناو دەبرێت، ئاگایی تایبەتیان هەبووە.

---

١- ابن رجب الحنبلي، كتاب الاستخراج، لە ناواخنی (في التراث الاقتصادي الاسلامي)، دار الحداثة، ١٩٩٠.

٢- يوسف القرضاوي، فقه الزكاة، مؤسسة الرسالة.

٣- محمد باقر الصدر، اقتصادنا، دار التعارف للمطبوعات.

٤- السيد محمد باقر الصدر، البنك اللاربوي في الاسلام، دار التعارف للمطبوعات.

گەورە پیاوانی وەك (ماوردي ـ غزالي ـ ابن جماعة ـ ابن تیمیة ـ ابن اخوة ـ ابن بسامي محتسب) چەندین پەرتووكیان لە پەراوێزی یاسای (حسبة ـ ڕێگری لە كاری ناشەرعی) داناوە، كە پیشاندەری بەرەوپێشچوونێكی ترە لە بواری فیقهی ئیسلامیدا، بە ناوی فیقهی بەڕێوەبردن و چاودێریكردنی بەسەر نەریت و سیستەمی گشتییەوە دەبێت. ماوردی لە (أحكام سلطانية)، (ابن تيمية، الحسبة في الاسلام)، (ابن جماعة متوفى ٧٣٣هـ) لە (نهاية الرتبة)دا، هەموو چاویان خستووەتە سەر ئەم بابەتە زۆر حەیاتییە لە فیقهی ئیسلامیدا و سەلماندوویانە كە فیقهی ئیسلامی تا چەند ئەندازە پەیوەندیی لەگەڵ ژیانی ڕۆژانە ـ مامەڵە بازرگانییەكان ـ و چاودێریكردنی كاروبارە داراییەكان هەیە. بۆ نموونە گەر پەرتووكی (ابن اخوة) بە چاوێكی خێرا سەرنج بدەین، دەبینین كە لە حەفتا بەشدا خەریك بووە بە مەرجەكانی (محتسب) و ئەركەكانیەوە كە بە گشتی لە چاودێریكردن بەسەر كاروبارە ئابوورییەكانی كۆمەڵگای ئیسلامیدا كورت دەبێتەوە و ڕێكخستنی گشتی و نەریتە پەسەندەكان لە بازاڕدا بگرە تا دەگات بە یەكیەكی لێهاتووییەكان و پیشە باوەكانی كۆمەڵگای كۆنی ئەو سەردەمەی بە جۆرێك باس كردووە كە پرسیارێك بۆ خوێنەر ناهێڵێتەوە.

(نهاية الرتبة)ی ئیبن بسام تا ئەندازەیەك درێژترە لە (معالم القربة)ی ئیبن اخوە، لەگەڵ ئەوەشدا ناوبانگی ئەوی دەرنەكردووە.[1]

ئەم پەرتووكانە جگە لە گرنگیی فیقهی لە گرنگی مێژوویی و خەڵكناسیشدا پشكیان بردووە، چونكە لێكۆڵەرەوەكان دەتوانن وەك شێوازی ژیانی كۆمەڵایەتیی سەدەی ناوینی ئیسلامی كەڵكیان لێ وەربگرن.

---

١- في التراث الاقتصادي الاسلامي، لەخۆگری سێ پەرتووك: معالم القربة، نهاية الرتبة، الحسبة الاسلام، چاپی یەكەم، دار الحداثة، بيروت ١٩٩٠.

## ١ـ ٣ـ ٥ نوێبوونەوە لە ئاینزا فیقهییەکاندا:

سەرهەڵدان و شێوازی وەرگرتنی ئاینزاکانی فیقه، چ ئەوانەی تۆمارکراون چ ئەوانەی تۆمار نەکراون، تاکی و کۆمەڵایەتی هۆکارێکی تر لە هۆکارەکانی نوێبوونەوەی فیقهە. مەبەست ئەوەیە کە ئەگەر لە سەرەتای دەرکەوتنی فیقهی ئیسلامییەوە پێشەوایانی وەك (حەسەن بەصری ـ موحەممەد بن سیرین ـ جەعفەر صادق ـ ئەبو حەنیفە ـ مالك بن ئەنەس ـ شافیعی ـ ئەحمەد بن حەنبەل ـ سوفیانی سەوری ـ ئیبن جەریر تەبەری ـ داود بن عەلی ئەصفەهانی....) رێگای ئیجتیهادیان لەپێش نەگرتایە و پاش خۆیان قوتابییان بەهەمان بۆچوون و هەمان بڕیارەوە پەروەردە نەکردبایە، کە جگە لە پاراستنی بەرهەمی پێشینان لە خۆبەرهەمی پێشکەوتووتر و داهێنەرانەتریان بەجێنەهێشتایە، هەر بەو جۆرە تا بە سەردەمی (تقلید) دەگەین، هەڵبەتە بێگومان زانستی فیقه نەیدەتوانی زانستێکی پایەدار و بزاوتوو و کاریگەر لە دروستکردنی بیری تاك و کۆمەڵدا بێت.

فەقیهەکانی ئەم مەزهەبانە کە هەڵگری پەیامی فیقه و پابەندی بە فراوانبوونی پەراوێزەکەیەوە بوون، هەماهەنگ لەگەڵ هەر سەردەم و قۆناغێکدا لە بەرەوپێشچوون و هەوڵداندا بوون و لەژێر کاریگەریی هەلومەرجی (ژینگەی زێتر لە سیاسی ـ ئابووری ـ کۆمەڵایەتی) بە فیقه و فەقاهەت بنەمایەکی تر و ئاڕاستەیەکی نوێیان بەخشیوە، بە گشتی لە هەوڵدابوون کە لە دەسەڵاتی سیاسیی رۆژ بە مەبەستی دروستکردنی زۆرترین کاریگەری لەسەر ژیانی خەڵکی، ئەوپەڕی سوودیان وەرگرتووە، تا لە فەرمیبوونی زۆرتر پشکیان بەربکەوێت.

مەزهەبە فیقهییەکان تاکو لە ئیجتیهاد و بۆچوونەکانیاندا بتوانن لە جموجۆڵ و ئازادیی زۆرتر بەهرەمەند بن، پەنایان بۆ هۆکاری جۆراوجۆر بردووە. بەم جۆرە هەم دواهاتی ئیجتیهادیان دەستبەسەردا گرتووە و هەم داهاتووی فیقه و ئاسۆکانی فراوانبوونی ئەویان دەستبەر کردووە. ئەم هۆکارانە بریتین لە:

١ـ دانان و دارشتنی ئوصولی فیقه: بەناونیشانی زانستێك كە بەڵگەی لێ هەڵگۆزین و هەلومەرجی حەقیقی و كەسێتیی موجتەهیدی لەپێشدا دیاری كردووە و كاری ئیجتیهاد و فەقاهەت، بەپێی یاسا و دەستووری زانستی و لۆژیكی، سیستماتیك كردووە.

٢ـ هەوڵ بۆ دانانی زانستێك بە ناوی (قواعد الفقه ـ یاساكانی فیقه) كە ئەحكام و كاروباری شەرعی و ئیجتیهادی لەژێر چەتری ئەحكامی ئیستیقرا[١] دا كۆكردووەتەوە و كاتی فتوا یان ئیجتیهاد لە بابەتێكی نوێدا، بەسوودوەرگرتن لەم یاسا گشتی و رەهەندییانە، بە چەسپاندن و بابەتی نوێتر دەگەشێن.

٣ـ هەوڵ بۆ ناسین و كۆكردنەوەی زۆرترینی ریوایات و بەرهەمەكانی پێشین لە سەرەتای ئیسلامەوە، واتە لە سوننەتی پەیامبەر ﷺ وتە و كردارەكانی هاوەڵان و تابعین. لەبەرئەوە هەموو ئەوانە لە ناسینی بونیاد و بنەما و بەشەكانی ئیجتیهاددا، هەڵبەت بە پلەی جیاواز، كاریگەرییان دەبێت.

٤ـ هاندان و گرنگیدان بە توێژینەوە لە ناكۆكییەكانی نێوان فەقیهەكان و دامەزراندنی زانستێك سەد لە سەد ئیسلامی. بە ناوی زانستی (خیلاف) كە لە سەردەمی ئەئیمە و موجتەهیدینەوە دەستی پێكردووە و تا بە ئەمڕۆ بەردەوامە.

٥ـ سوودوەرگرتن لە زانستەكان و زانیاریی رۆژ و ئاشنایی بە دەستكەوتەكانی بەرەوپێشچوونی وەرگێڕانی كەلەپووری یۆنان و میللەتەكانی تر، كە لەسەردەمی زێڕینی ئیسلامدا (سەدەی چوارەمی كۆچی) ئەنجام درا، وەها دروستكردنێكی بەخشییە فیقه كە توانیی هاوڕا لەگەڵ لۆژیكی ئەرستۆیی و گونجاو لەگەڵ فەلسەفەی فەلاسەفە ئیلاهییەكاندا، پێشكەوتن بەدەستبهێنێت. بە جۆرێك كە غەزالی لە پێشەكیی (المستصفی) كورتكراوەیەكی زۆر گرنگ لە زانستی لۆژیك، بە ناونیشانی میلاكی گشت زانستەكان و مەرجی پێویستی زانا بوون، بنووسێت و گوزارشتی بكات[٢] و پێش ئەو

---

١- استقراء: گەشتن لە هەندەكییەوە بۆ گشتی (من الجزئي الى الكلي).

٢- الغزالي، المستصفی، ج١، ص١١ـ ٥٥.

(إمام الحرمين) به لەبەرچاوگرتنی پاشەکەوتە فەلسەفییەکانی سەردەمی خۆی، (بورهان و ئیرشاد و شامیل)ی نووسی.

کاردانەوەی کولتوور و لۆژیکی یۆنان لە بەرهەمەکانی فەقیهەکاندا و چۆنیەتی هەڵسوکەوتیان بە شێوازەکانی بەڵگەسازی، نەك خاڵی لاوازە بەو جۆرەی کە هەندێك کەس ئەمڕۆکە دێت بە خەیاڵیاندا، بەڵکو بەڵگەی بەهێزییەکە کە لە کارەکانیاندا هەیە، چونکە فەقیهی موسڵمان ئەرکدارە بەوەی لە هەر سەردەم و کاتێکدا ئامادەیی هەبێت کە زانیارییەکانی ئەو ڕۆژگار و سەردەمە لە بۆچوونیدا بێت و هەماهەنگ لەگەڵ زانستی مرۆیی بەربڵاو لە جیهاندا، فیقە و فەقاهەت بجووڵێنێت، لەوکاتەدا کە فیقە نەك زانستێکی سنووردار بە بازنەی ئوممەتی ئیسلام، بەڵکو زانستێك دەبێت بە مۆرکی جیهانی و مرۆیی.

نموونەی فەقیهێکی موسڵمان کە لە سەردەمی نوێدا توانیی فیقە لە جیهانی ئیسلامییەوە بە ئاسۆیەکی فراوانتر بناسێنێت (دکتۆر موحەممەد فەتحی)ی ئیسلامناس و مافناسی میسرییە، کە لە ساڵی ١٩١١ لە ئەڵمانیا توانیی تێزی دکتۆراکەی دەربارەی (تیۆری دەستدرێژی لە بەکارهێنانی مافدا لە دیدگای فەقیهە موسڵمانەکانەوە) پێشکەش بکات و بووە هۆی سەرسوڕمانی مافناسانی ئەڵمانیا، تا ئەو جێگەی کە مافناسی گەورەی ئەڵمانیا (کهلر) دەربارەی بنووسێت:

(ئەڵمانییەکان ماوەیەکی زۆر شانازییان بەسەر ئەوانی تردا دەکرد کە توانیویانە لە ساڵی (١٨٧٨)ی زایینیدا سەبارەت بەدەستدرێژی لە بەکارهێنانی مافدا یاسا دابنێن. بەڵام بە رەچاوی پەرتووکەکەی موحەممەد فەتحی کە لەم بابەتەدا بۆچوونی مافناسانی موسڵمان دەگێڕێتەوە کە لە سەردەمی هەشتەمی زایینییەوە بە درێژی لەوبارەوە بۆچوونی خۆیان دەربڕیوە، چیتر دەبێت ئەڵمانییەکان ئەم شانازییە بە هەڵگرانی

شەریعەتی ئیسلامی بسپێرن، کە دە سەدە پێش ئەمان بیردۆزێکی لەم جۆرەیان ناسیوە.[1]

نموونەیەکی تر ئوستاد (موحەممەد عەلی بدوی)یە، کە لە کۆنگرەی یاسای بەراوردکاریی (تەتبیقی)[2] لاهای لە ساڵی ١٩٣٢، توێژینەوەیەکی دەربارەی پەیوەندیی دینەکان و یاسا لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا، پێشکەش کرد، کە تێیدا سەلماندی شەریعەتی ئیسلام هەماهەنگ لەگەڵ پێشکەوتنی زانستەکان و تەکنەلۆژیا و گۆڕانکارییەکانی تری ژیان، بەرەوپێش دەڕوات، سەرئەنجام بەشداربووان لەگەڵ بڕیارەکانی کۆنگرە بڕیارياندا کە:

(شەریعەتی ئیسلامی بە سەرنجدان لەو گرنگی و بەهایەی کە لە زانستی ماف و یاسای نوێدا هەیەتی، سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی یاسای تەتبیقی و بەراوردکارییانە و لە کۆنگرەی داهاتوودا بەشێکی تایبەت بە مەبەستی توێژینەوە لێی، تایبەت دەکرێت پێیەوە).[3]

لە ساڵی ١٩٤٨دا لە کۆنگرەی یاسای نێونەتەوەیی لە لاهای، (شێخ مەحموود شەلتوت) و (شێخ عەبدوڕەحمان حەسەن) بە نوێنەرایەتیی زانکۆی ئەزهەر، لە دوو وتاریاندا سەبارەت بە فیقهی ئیسلامی و وەرنەگرتنی کاریگەری لە یاساکانی رۆم، بەرپرسیارێتیی شارستانی، سزا لە فیقهی ئیسلامیدا پیشانیان دا و کاریگەرییەکی وەهایان بەسەر بەشداربووانەوە بەجێهێشت، کە لە بڕیارنامەکەی کۆنگرەدا بڕیاريان دا کە:

(شەریعەتی ئیسلامی یاسایەکی زیندوو و گونجاوە، لەگەڵ پێشکەوتنی سەردەمدا لێوەشاوەیی هەیە و سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی یاسای بەراوردکاری، زمانی

---

١ د. عبدالمنعم النمر ـ علم الفقه، ص٩ـ ١٠.

٢ تطبيقي: جێبەجێکردن و پراکتیزەکردن.

٣ هەمان سەرچاوە، ل١٠.

عەرەبی لەمەودوا بە ناونیشانی زمانێکی کارپێکراو لە کۆنگرەدا هەژمار دەکرێت.[1] لە ساڵی ١٩٥١ لە پەیمانگای یاسا لە زانکۆی پاریس، کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵەی جیهانیی یاسای تەتبیقی لەژێر ناونیشانی (هەفتەی فیقهی ئیسلامی) ڕێکخرا، تێیدا پێنج توێژینەوەی فیقهی لە پەراوێزی پێنج بابەتی فیقهیدا کە ئەمینداری کۆمەڵەی جیهانیی یاساکان دایناوبوو، بووە جێی باس و گفتوگۆ لەسەرکردن. ئەو پێنج بابەتە بریتیبوون لە:

سەلماندنی خاوەندارێتی، گواستنەوەی خاوەندارێتی بە بەرژەوەندیی گشتی، بەرپرسیارێتیی سزایی، کاریگەریی بەرامبەری مەزهەبە فیقهییەکان، تیۆری ڕیبا لە ئیسلامدا. ئەم بابەتە بە زمانی فەرەنسی و بە شێوازێکی داهێنەرانە و نوێ، گونجاو لەگەڵ هەلومەرجی نوێی سەردەمدا، پیشان درا و بووە هۆی سەرسوڕمان و جێی سەرنج، تا ئەو جێگەی یەکێك لە بەشداربووان ئاشکرای کرد:

چۆن دەتوانرێت باوەڕ بکرێت کە فیقهی ئیسلامی فیقهێکی چەقبەستووە و توانای یاسادانانی نییە لە کۆمەڵگای نوێ و پێشکەوتوودا؟ لەکاتێکدا ئێمە ئەم کۆ باسانە دەبیستین کە پێچەوانەی ئەم داوایە بە دەقەکان و بنەماکان، دەسەلمێنن.

لە کۆتاییدا بەشداربووان بەوپەڕی دڵنیاییەوە بەم ئەنجامە گەشتن:

بونیاد و بنەمای فیقهی ئیسلامی خاوەن بەهای یاسایی بەرزە و ڕاجیاوازیی ئاینزای فیقهی لەم کۆمەڵە یاساییە گەورەدا لەخۆگری بەشێکی زۆر لە چەمکەکان، زانیارییەکان و بونیادی یاساییە، کە فیقهی ئیسلامی لەسەر بنەمای ئەمانە دەتوانێت وەڵامدەرەوەی گشت پێویستییەیکانی ژیانی شارستانی بێت، ئومێد دەکرێت کە ڕێکخراوێك بۆ دانانی (دائرة المعارف)ی فیقهی ئیسلامی دابمەزرێت.

ڕۆژهەڵاتناسی رۆمانیایی (فمبری)، کاتێك لە گەنجینەی فیقهی ئیسلامی ئاگادار بوو، ڕاشکاوانە گوتی:

---

١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٠.

فیقهی ئیسلامیی ئێوە زۆر فراوانە، تا ئە وشوێنەی کە من زۆر سەرم سوڕدەمێنێت بۆچی ئێوە سیستەم و یاسای وڵاتەکانی خۆتانتان لێ هەڵنەگۆزیوە؟![1]

دکتۆر عەبدورڕەزاق سنهوری، باوکی یاسای گشتیی هەموو وڵاتە عەرەبییەکان، چەندین جار دەیانگوت لە شەریعەتی ئیسلامیدا ـ هەڵبەت مەبەستی ئەو مەزهەبە فیقهییەکان بوو ـ پێکهاتەیەك هەیە کە ئەگەر یاسادانەرێك خەریکی بێت و بتوانێت باش سوودی لێ وەربگرێت، دەتوانێت تیۆری و بونیادی وەهایان لێ دروست بکات کە لە رووی پێشکەوتن و رۆچوونەوە لە تیۆری بنەماکانی رۆرژئاوا کەمتر نەبێت.[2]

## ١ـ ٣ـ ٦ نوێبوونەوە لە زمان و شێوازی نووسیندا:

لە بەرەبەیانی مێژووی فەقاهەت و ئیجتیهادەوە، فەقیهەکان و موجتەهیدەکان زمانێکی چوونیەکیان نەبووە و پەیڕەوی یەك شێوازیان نەکردووە بۆ نووسین و کۆکردنەوەی، ئەم زمانە لەگەڵ تێپەڕبوونی مێژوو لەبەرەوپێشچوون و هەوڵدا بووە. لەم بوارەدا ئەم خاڵانە جێی سەرنجن:

**یەکەم:** زمانی فەقیهەکان زمانی فەرمان و نەهی کردن بووە، واتا روونکەرەوەی حەڵاڵ و حەرام بووە، فەقیهەکان هەمیشە ئەو مافەیان بەخۆیان داوە کە لە پێگەیەکی باڵاترەوە تاك و چینی خەڵك، بگرە چینی دەسەڵاتداران، بکەنە لایەن لە وتارەکانیاندا و جێی پرسیار و لێپرسینەوەش، بەو بەڵگەیەی کە ئەوان پاڵپشتی شەریعەتن و ئاگادارن لە نهێنییەکانی. لە سەردەمی ئەبو حەنیفە کە خۆی بە بەهێزتر دەزانی لە خەلیفەی کات و لە وەرگرتنی پۆستی دادوەری سەرپێچیی دەکرد تا دەگات بە (ولي الله دهلوي)، کە لە پەرتووکی (حجة الله البالغة) بە نهێنییەکانی شەریعەت رادەگەیشت.[3]

---

١ - نظام الدين عبدالحميد، چەمکی فیقهی ئیسلامی، ل٩.

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩.

٣ - ولي الله دهلوي، حجة الله البالغة، ص٢ـ ٥.

**دووەم:** فەقیهەکان تەنها دەقی جێگیریان بە بەڵگە دادەنا و ئەرکی دەقیی ئەو دەقەیان بە کاریگەر لەسەر داکەوتە (واقیع) دەزانی، لەبەرئەوە هەموو هەوڵی ئەوان لە دەورووبەری واتا و مەفهوومی دەقدا بوو، بەشوێن بەدەستهێنانی ئەحکامەکانی ژیانەوە بوو. ئەوان کاریگەریی پێکهاتەی جێگیریی دەق لە پێکهاتەی گۆڕاوی کاتیان بەبێ هیچ کێشە و تێبینییەك قبوڵ کردبوو، باوەڕیان وەها بوو دەق کەلامی خودایە، واتا ئیرادەی خودایە و جلوبەرگی زاراوەکانی لەبەرکردووە و لە تێپەڕبوونی کات ئاشکرا بووە و دەرکەوتووە، واتا ڕاستەقینەیەکی جێگیر کە بەپێی داخوازی کات تەفسیر و روون دەکرێتەوە.

زۆربەی بەرهەمی فەقیهەکان و ئوصولییەکان، لە (شافیعی) لە سەدەی دووەم تا (شاطبی) لە سەدەی هەشتەم، هەڵبەت جگە لە (ابن حزم) کە حاڵەتێکی سەرپەڕە و بە پێچەوانەی رێڕەوی فەرمییە و زۆر جار هەژمار نەکراوە، باس لەوە دەکات گەورەیی دەق پێش ئەوەی جیهانێك لە ئەحکام و دەستوور و مەبەستەکان بێت، پێکهاتەیەکە لە (واژەکان ـ رستەکان ـ لێکدراوەکان) و زمانناسان پشکێکی کاریگەر لە ناسینی هاوشێوە و هاوچەشنەکان (الأشباه والنظائر) دەگێڕن. هەمان دیاردە کە لە بەرهەمەکانی (مقاتل ـ فراء ـ أبوعبید) لە پەنای (رسالة)ی شافیعیدا دەردەکەوێت[1].

سێهەم: زمانی فەقیهەکان زۆربەیان، زمانی رابردووەکانە، زمانێك کە باس لە عەقڵیەتی پێشینگەرا دەکات، ئەم زمانە بە جۆرێك پەیوەستە بە پێشینانەوە کە ماوە بە چۆن و بۆچی نادات، نموونەی کامڵبوونی ئەم زمانە لە بەرهەمەکانی ئوصولییەکاندا دەبینین. ئوصولییەکان نەك تەنها لۆژیکی زمانناسانیان کردووە بە بناغەی کاری خۆیان و خاڵی دەستپێکردن، بەڵکو وەك مەرجی پێویستی فەقاهەت و ئیجتیهاد هەژماریان

---

١- عبدالجواد یاسین، السلطة في الاسلام، العقل الفقهي السلفي بين النص والتأريخ، ص٣٦ به دواوه.

کردووه، تا ئەو جێگەی کە یەکێك لە فەقیهەکان بە روونی ئاشکرای کردبوو (من ماوەی سی ساڵە کە لە فیقهدا لە رووی پەرتووکی سیبەوەیهییەوە بۆ خەڵکی فەتوا دەدەم).[1]

شاطبی کە ئەم گوتارەی لە (موافقات)دا هێناوەوە، خۆی بە بەڵگەی دەرچوون لە لۆژیکی کلاسیکی زماناسان، وەك یەکێك لە نوێخوازانی زانستی ئوصول دێتە هەژمار، نەك ئەم قسە حەتمییەی ئینکار نەکردووە، بەڵکو بەم جۆرە ئاراستەی کردووە (پەرتووکی سیبەوەیهی ئەوەندە گشتگیر و کۆکەرەوەیە کە جگە لە (نحو)، زانستەکانی تری وەك زانستی (معاني ـ بيان ـ دەستکارییەکانی ألفاظ ومعاني) دەگرێتەوە،[2] ئەم هەڵسوکەوتە پارێزکارانەی شاطبی کە بە تەواوی لەگەڵ شێوازی (استقراء ـ ترکیبي ـ زمانی ئامانج گەرای ئەودا بێگانەیە ـ دروستبووی ئەو دەسەڵاتەیە کە پێشینانی زمان و ئەدەبیاتی عەرەب و فیقه، کە شافیعی یەکێك لە پێشەواکانی ئەو ڕەوتەیە، لەسەر پانتایی ئوصول هەیان بووە.

(قیاس، یەکێك لە بەشە هاوبەشەکانی نێوان زانستی (نحو ـ فقه)، کیسائی گوتبووی: نەحو قیاسێکە کە پەیڕەو دەکرێت. (ابن الانباري) باوەڕی وەهابوو کە (نەحو هەمووی قیاسە و هەرکەس بەرهەڵستیی قیاس بکات، بەرهەڵستیی نەحویش دەکات). (جلال الدين سيوطي) لەسەر ڕێچکەی ئوصول فیقه پەرتووکێکی لە بنەماکانی نەحودا بە ناوی (الاقتراح) هەیە، کە چەسپاندنێکی ترە لە واژەکانی ئوصول لەسەر نەحوی عەرەبی.

لە گفتوگۆیەکدا کە لە نێوان فەڕائی نەحوزان و موحەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانی رووی داوە و ئەبو حەییان لە (محاضرات العلماء) و (یاقوت) لە (معجم الادباء)دا هێناویانە، بە باشی دەرك دەکرێت کە گرنگیی زمانی عەرەبی لە ئاڕاستەدان بە زانستی ئیسلامی، لەوانەش فیقه، تا چ ئەندازەیەك بووە.

---

١- الشاطبی، الموافقات، ج٤، ص١١٥ـ ١١٦.

٢- ياقوت الحموي، معجم الأدباء، ج١، ص٦٨ـ ٦٩.

ڕۆژێك فەڕڕاء لەگەڵ شەیبانی بەیەکەوە لەبارەی فیقھ و نەحووەوە گفتوگۆ دەکەن، فەڕڕاء گەورەیی نەحو دەدات بەسەر فیقھداو شەیبانی گەورەیی فیقھ دەدات بەسەر نەحو دا، تاکو ئەوەی کە فەڕڕاء گوتی: (ئایا کەسێك پەیدا دەبێت کە لە زمان و ئەدەبیاتی عەرەبیدا لێکۆڵینەوەی کردبێت و لە خوێندنی زانستی تردا بێ توانا بێت؟ شەیبانی گوتی (ئەی ئەبا زەکەریا لە ئێوە کە لە ئەدەبیات و زمانی عەرەبیدا زۆر لێکۆڵەرەوەن، پرسیارێکی فیقهی دەپرسم، ئایا دەتوانی بە پێی (عەرەبی) وەڵامی بدەیتەوە؟ گوتی: ئەو پرسیارە بهێنە خودا بیدات بەرەکەت. شەیبانی گوتی: چی دەڵێیت دەربارەی کەسێك نوێژ بکات و لە نوێژەکەیدا هەڵە بکات پاشان سوجدەی سەهو بەرێت و لە سوجدەکەشدا هەڵە بکات؟ فەڕڕاء کەوتە بیرکردنەوە نزیك بە کاتژمێرێك، گوتی: شتێکی لەسەر نییە! موحەممەد گوتی: بۆچی؟ گوتی بەو بەڵگەیەی کە لەلای ئێمەی نەحوییەکان ناوی (مُصَغَّر تصغير) ناکرێتەوە. لە نوێژیشدا سوجدەی سەهو بۆ تەواوکردنی نوێژەکەیە و تەواوکردن بۆ تەواوکردن بوونی نییە! شەیبانی گوتی: گومان ناکەم کە ژنێك منداڵێکی وەکو تۆی ببێت.

تێبینی دەکرێت، شێوازی قیاس لە کاری فەڕڕاء و شەیبانیدا شێوازێکی هاوبەشە.

چوارەم: زمانی فیقھ بەزۆری زمانی تەکلیف و فرمانپێدانە نەك زمانی ماف، کەسی دیندار بەپێی ئەم پێناسەیە پێش ئەوەی بیر لە مافەکانی بکاتەوە، بیر لە ئەرکەکانی دەکاتەوە و پێش ئەوەی کە ببینێت خۆی چیی دەوێت، دەبینێت کە خودا چی لێی دەوێت، لە جیاتی ئەوەی لە نێو مافەکاندا بگەڕێت تاکو ئەرکەکانی پەیدا بکات، لە ئەرکەکانیدا دەگەڕێت تاکو مافەکانی بەدەستبهێنێت، هەر ئەمەش دەبێتە هۆکار تاکو هەستیاریی سەبارەت بە مافەکان کەمتر بێت تاکو ئەرکەکانی.[1]

پێویستە بگوترێ بیرۆکەی (ماف) لەگەڵ چەمکی (ئەرکەکان)، لە زمانی عەرەبی و مەیدانی کلتووری ئیسلامیدا، دوو چەمکی پێکەوەبەستراون، ئەوەی بۆ مرۆڤ بە ماف

---

١- عبدالكريم سروش، فربەتر از ايديولوژى، ل٢٨٣.

دەناسرێت ئەركێكە كە ئەویتر دەبێت ئەنجامی بدات، هەركات مەسەلەكە پەیوەندیی بە هەردوو لاوە هەبێت، كە لە پەیوەندیی ماف ـ ئەرك دا پێكەوە چوونە نێو یەكیان هەیە، هەرشتێك كە لەسەر یەكێك لەوان فەرز بێت بۆ ئەوی تر بە ماف هەژمار دەكرێت.[1]

لێكپچڕانێك كە لە ڕوانینی یەكەمدا لە نێوان (مافەكان) و (ئەركەكان)دا بەرچاو دەكەوێت، دروست بوو، لە كاریگەریی كولتووری ڕۆژئاوایی لەسەر توێژینەوەكانی پەیوەست بە مافی مرۆڤ لە دونیای هاوچەرخدایە، كە بە جۆرێك خۆپیشان دەدەن كە دەڵێی لە هزری ئیسلامیدا بابەتی (ماف) تەرك كراوەو جێهێڵراوە و ریزبەندی كراوە لە ئەركەكاندا، بەڵام ئەم قسەیە ناتوانرێت بە گشتی و بە كورتی بە راست بزانرێت، چونكە هەر جۆرە باسێك لە پەراوێزی ماف لە تێڕوانینی ئیسلامەوە، ڕوویەكی ترە لە باسكردن، كە دەربارەی ئەركە ئیسلامییەكان واتا مافی خودا، بریتییە لەو ئەركانەی كە مرۆڤ لە بەرامبەر خودادا ڕووی لێنراوە بە ئەنجامدانیان، مافی مرۆڤ هەم هەموو كاروبارە ماددی و رۆحییە پێویستەكانە بۆ مرۆڤ كە خوازراوی رێزلێنانی خواییە، كە پێی رەوا بینیوە، بە دەربڕینێكی تر، لە ئیسلامدا بۆ مرۆڤ دوو جۆر ماف لەبەرچاو گیراوە:

١ـ مافی گشتی: بریتییە لە مافێك كە بۆ هەموو مرۆڤەكان بەدەر لە رەنگ، رەچەڵەك، پلە، رەگەز، جێگیر كراوە.

٢ـ مافی تایبەت: بریتییە لە مافێك كە بۆ گرووپێكی تایبەت لە مرۆڤەكان لەبەرچاوگیراوە، وەكو مافی بێدەسەڵاتەكان ـ مافی ژنان ـ مافی كەمایەتییەكان لە كۆمەڵگای ئیسلامیدا.[2]

لەبەر هەستیاریی ئەم بابەتە، ئێستاكە نووسینە فیقهییەكان بە ئاڕاستەیەكدا بەرەوپێش دەڕۆن كە مرۆڤەكان بە جۆرێك لەگەڵ فیقهی ئیسلامیدا ڕووبەڕوو دەكەنەوە

---

١- محمد عابد الجابري، الديمقراطية وحقوق الانسان، ص٢٠٨.

٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٩.

کە لەخۆگری مافەکانیانە. بە ئاراستەیەك کە تاکی موسڵمان پەروەردە بکەن بەجۆرێك ئەوەندەی بۆ گەیشتن بە مافەکانی هەوڵ دەدات، بۆ ئەرکەکانیشی هەوڵبدات.

شێوازی نووسینی دەقە فیقهییەکان لە رابردووەوە تا بە ئەمڕۆ، کە گۆڕانکاریی زۆری بەسەردا هاتووە (لە سادە و کورتەوە بۆ ئاڵۆز و وردکراوە و هەندێك جار بۆ ناڕوون و نادیار گۆڕاوە، ئەمڕۆ لایەنخوازیی فەقیهەکان و نووسەرەکان بە شێوازێکە کە نووسینی بابەتە فیقهییەکان بەدوور بێت لە ئاڵۆزی، ناڕۆشنی (إن قلتَ قُلتُ، تعددي ضمائر، ایجازی مخل و اطنابی ممل) نموونەی نووسراوێکی سەردەمییانە بە شێوازێکی نوێ و داهێنەر لە نێوان ئەهلی سوننەتدا. پەرتووکی (فقه السنة) بەرهەمی ئوستاد (الشیخ سید سابق المصري)ە، لە نێوان ئەهلی تەشەییوعیشدا (فقه الامام جعفر الصادق) دانراوی ئوستاد (الشیخ محمد جواد مغنیة)ی لوبنانی، دەبێت.[1].

## ١ـ ٣ـ ٧ نوێبوونەوە لە ئەرکەکاندا:

زانستی فیقه وەك زانستێکی کۆمەڵایەتی، پەیوەندییەکی زۆر نزیکی لەگەڵ ناسینی کۆمەڵگا و تۆڕی پەیوەندییەکاندا هەیە، بە راستی لە هەوڵدایە کە ئەحکامی رووداوە کۆمەڵایەتییەکان لە رووی سەرچاوەی شەرعی و رێگاکانی بەڵگەسازیی هزرییەوە، هەڵگۆزێت. بەمشێوەیە کەسی فەقیە کەسایەتییەکە بە پێناسی چالاکخواز، کاریگەر، وەرگری کارتێکەر، لە ژینگەی کۆمەڵایەتییدایە. فەقاهەت پاشهاتێکی هزرییە کە چۆنیەتیی چەسپاندنی جیهانبینیی دینی لەگەڵ رەفتاری تاکدا لە چوارچێوەی کۆمەڵگا، دەخاتە ژێر باس و توێژینەوەوە.[2]

---

١- سەیری: السید سابق، فقه السنة، لە ٣ بەرگدا. محمد جواد مغنیة، فقه الامام جعفر الصادق، ٣ مجلد، چاپی چوارەم، بکە.

٢- د. محمود علیمات، الابعاد الاجتماعیة في اعداد طالب الفقه الاسلامي، مجلة قضایا اسلامیة معاصرة، العدد ٧، ١٩٩٣، ص٢٣٦ـ ٢٣٧.

بێگومان وەرگرتنی دین و رازی بوون بە فێرکارییەکانی، لە خوونەریتی خەڵکیدا کاریگەری دادەنێت. لەم لایەنەوەیە کە پەیامی فیقه بە سەرنجدان لە ئایەتی پیرۆزی (لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ) (التوبة: ١٢٢) پەیامێکی چاکسازییە، کە مەودای کارەکانی (مرۆڤەکان، دەروونەکان، خێزان، گرووپە کۆمەڵایەتییەکان) کە سەرەتا دەبێت دەستنیشانیان بکات و لە لایەنە جیاوازەکانەوە دەرییبکات و تایبەت بە چالاکییە تاکی و گرووپی و کۆمەڵایەتییەکان حوکم دەربکات. جگە لە دەرکردنی ئەحکام، بە پێشکەشکردنی چارەسەری کێشە و گرفتەکانیانەوە خەریك ببێت.

سەرئەنجام فەقیهەکان لە هەلومەرجی ئایدیالدا دەتوانن لە شێوەگیریی کۆمەڵگای ئیسلامی و ئیمانی و بەڕێوەبەرایەتی و مانەوەیدا رۆڵی سەرەکی بگێڕن. هەروەها لە هەلومەرجی قەیراناویدا فەقیهی راستەقینە هەڵگری ئاڵای ململانێیە دژ بە لادان و لەناوچوون. فەقیه لە مەودای چالاکییە زهنییەکاندا پارێزەری کەلەپووری پێشینانە و کەسێکە کە دڵەڕاوکێی ئێستا و داهاتووی میللەتی هەیە، بۆ ئەم کارە لە دەقەکانی قورئان و سوننەت و زانیارییەکانی سەردەمی خۆی زۆرترین سوود وەردەگرێت. لە مەودای چالاکییە کۆمەڵایەتییەکاندا زانایە کە چاو دەخاتە سەر چاکسازی و زیندووکردنەوە و نوێکردنەوەی دینداری، تاکو خێزان و کۆمەڵگا و حکومەت بۆ باش و باشترین بانگهێشت دەکات.

فیقه و فەقیه، بەدرێژایی مێژوو رێگایەکی پڕ لە بەرزی و نزمییان بڕیوە و هەنگاو بە هەنگاوی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و گونجاو لەگەڵ رێڕەوی بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی ژیاری ئیسلامیدا، هەندێك جار فراوان و هیوابەخش، هەندێك کات بە ئازار و گۆشەگیر بووە.

گریمانەی ئەوە دادەنێین کە فەقیه جگە لە زانستی ئەحکام، ئاگاداری فەلسەفە و هۆکاری ئەحکامەکان و باکگراوندی مێژوویی راستەقینەیە، کەوایە گەر لە سەردەمەکانی رابردوودا کەسێك جگە لە کەسانی تایبەت، لەم جۆرە بابەتانەیان نەدەخستە ڕوو، ئەمڕۆ لە کۆڕە زانستی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و زانکۆییەکاندا، هەتا لە نێو زۆرینەی

خەڵکدا، لەم شێوازە پرسیار و گومانانە زۆرە، پێویست دەکات کە فیقهی هاوچەرخ لە وەڵامدانەوە و داکۆکیکردن لە فەلسەفە و هۆکارەکانی ئەحکام، لۆژیکی بەهێز و رازیکەری پێبێت. ئەو دەبێت بە شێوەیەکی کۆکەرەوە و رێگر، فیقە بخاتە ژێر تێڕوانین و بەڵگەی شەرعیی لە زهنیدا کۆکردبێتەوە، کە لە هەر پێگە و کۆڕێکدا بە توانا بێت لە روونکردنەوە و تەفسیر و هەتا بەڵگە بۆ هێنانەوە و تەئویلکردنی ئایەت و حەدیس و ئەحکام و بابەتە فیقهییەکاندا. زێتر لەمانە چالاکییە کەسییەکان و پێویستیی هاوکاری لەگەڵ فەقیهەکانی تریش لەبەرچاو بگرێت و لەگەڵیاندا بۆچوونەکانی بگۆڕێتەوە و بە دانبەخۆداگری و هۆشیاریی تەواوەوە پێشوازی لە بابەتە نوێیەکان بکات.

ئەگەر لە بارودۆخی دواکەوتوویی میللەتدا زانیاریی کەم و ئاسۆیەکی سنووردار بۆ فەقیە بەس بووبێ و نیازی دەکرد لە گەڕانەوە بۆ فتوای پێشینان و ئیجتیهاد، لە قۆناغی نوێدا کە میللەت لە حاڵی دووبارە نوێبوونەوەدایە و ئاڕاستەیەکی بەرەو داهاتوویەکی رووناکی لەخۆگرتووە، ئەرکی ئەو لە ئەرکەکانی زانایانی تر لە بوارەکانی تردا جودا نییە، ئەویش دەبێت بە گەنجینەیەك لە ئەحکامی حەڵاڵ و حەرام، دەبێت و نابێت، لە دانانی ئەحکامی شەرعی و سیستماتیکبوونی ژیانی دینی و نادینی و بوونی بارودۆخی دونیایی، پشکێکی بەرچاوی هەبێت.

فیقهی نوێخواز کاتێك دەچەسپێنرێ کە فەقیە ئەم ئەرکانەی خوارەوە بە رێکخستنێکی لۆژیکی بگەیەنێتە ئەنجام:

١- بوونی ئەزموونی دینی: سەرەتا دەبێت فەقیە ئەزموونێکی دیاریکراوی دەروونی و دەروونگەرای هەبێت، کە خۆی بینیبێتی و دەستی لێدابێت و هەستی پێ کردبێت، واتە حەزی دینداری و پەیوەندی لەگەڵ خودای بۆخۆی چەشتبێ. ئەمە هەمان مەرجە کە لە فیقهی کلاسیکی خۆماندا پێی دەڵێین (وەرع)، (تەقوا) و ئەم پەیوەندییە رۆحییە لەگەڵ خوای خۆیدا بە بەردەوامی بهێڵێتەوە.

٢- ئاگاداربوون لە کۆمەڵگا و گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان: ئەمڕۆ کۆمەڵناسی یەکێکە لە زانستە مرۆڤایەتییە فرە تەوەرەییەکان، جێگای گرنگی هەیە بۆ چاکسازیخوازان و

زیندووکەرەوەکان، تێیدا چەندین قوتابخانە و لایەنخوازی زۆر سەریان هەڵداوە کە هەریەکەیان بە جۆرێك بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگا لە گۆڕەپانی مێژوودا تەفسیر و ئاڕاستە دەکات و بەڵگەی بۆ دەهێنێتەوە، قوتابخانە وەك (پێکهاتەگەرایی ـ ئامرازگەرایی) و بە باکگراوەندەکانی فیکری و کولتووریی زۆر جیاواز لەگەڵ کۆمەڵگای ئیسلامیدا، هاتوونەتە نێو کولتوور، بیری ئێمەوە و خوازراو و نەخوازراو، نەوەی نوێ لەگەڵیدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە. فەقیهی هاوچەرخ دەبێت لەگەڵ بۆچوون و بیرۆکەکاندا بکەوێتە باس و گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە و لێکی جیابکاتەوە کە تاکێکی موسڵمانی پابەند بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ چ هەڵوێستێك وەربگرێت؟ هەڵوێستێك کە شوناسی بپارێزێت و دووری بخاتەوە لە پاشکۆبوون و هەڵوەشانەوە و کۆپیکردنەوە. لەبەرئەوە فەقیه پێویستە لە ڕۆحێکی ڕەخنەگرانە و ویژداندارانە بەهرەمەند بێت.

فەقیهێك کە سەبارەت بە ڕەوتی فیکری هاتوو لەلایەن ڕۆژئاواوە بێئاگا یان کەمئاگا بێت، ناتوانێت پەیامی سەرەکیی فەقاهەت بەو جۆرە کە پێویستە، ڕای بگەیەنێت، بە سەرنجدان لە بەها شەرعی و فیقهییەکان، بەگوناهکار و هەڵە هەژمار دەکرێت.

فەقیه پێویستی بە ناسینی تیۆری و کۆمەڵناسییەکی وردە، تاکو ئامراز و شێوازەکانی شرۆڤەی ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکانی پێ بناسێنێت، ئەگەر ناسینێکی لەو جۆرەی نەبێت، پێویست دەکات لە کۆمەڵناسان و فەیلەسوفەکانی تر کەڵك وەربگرێت بۆ کارەکانی. فەقیهێك کە کۆمەڵگای خۆی نەناسێت چۆن دەتوانێت بۆ تاکەکانی و بۆ کۆمەڵگاکەی بڕیار بدات، یاخود بە دوای چارەسەری کێشەکانیەوە بێت؟!

٣ـ ئاشنایی لەگەڵ سوننەتە خواییەکاندا لە بەرەوپێشچوونی مێژوو و ڕێگەی کۆمەڵگا:

فەقیهی هاوچەرخ لەسەر خۆی بە پێویستی دەزانێت، کە سەیری یاسا خواییەکان بکات لە ژیانی تاکەکانی گرووپ و کۆمەڵگاکاندا و لەبەر ڕووناکیی ئایەتەکانی قورئان و حەدیسەکانی پێغەمبەردا خوێندنەوەیان بۆ بکات، تاکو لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ڕووداوەکان، لادانەکان، خووەکان و تەقلیددا، نەکەوێتە هەڵەوە و بەلاڕێدا نەڕوات.

ئوستاد عەبدولکەریم زەیدان لەم بارەیەوە پەرتووکێکی زۆر هەڵبژاردەی نووسیوە بە ناونیشانی (السنن الالهية في الأمم والجماعات والأفراد في الشريعة الاسلامية)، ئەم پەرتووکە بە هەنگاوێکی سەرکەوتوو لە رێگەی ناسینی یاسا خواییەکاندا هەژمار دەکرێت.[1]

٤ـ بەشدارییکردن لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا: فیقه کاتێك نوێخواز و چالاك دەبێت کە کەسی فەقیه لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا خاوەن بەشداریکردنی راستەقینە بێت، لەم لایەنەوە فەقیهەکانی وەك ئیبن حەزم و ئیبن تەیمیە لە کۆندا و صدیق حەسەن خان و شەوکانی لە قۆناغەکانی دواییدا، توانیویانە فیقهێکی چالاك و بەرەوپێشچوو بەرهەم بهێنن.

## ١ـ ٣ـ ٨ نوێبوونەوە بە پەیوەندی لەگەڵ زانستە نوێیەکاندا:

زانستی فیقه زانستێکە نەك تەنها لەگەڵ (زانست و زانیارییە ئیسلامییەکاندا) بەڵکو لەگەڵ گشت زانستە مرۆییەکاندا چ کۆن چ نوێ، پەیوەندیی هەیە، بەو بەڵگەیەی فیقه زانستێکە دینی، کە بابەتەکەی هەڵسوکەوتی مرۆڤە. ئەو هەڵسوکەوتە چ خۆویستانە و چ خۆنەویستانە بێت، بە گوتار بێت یان بە کردار، کە لە هەموو باکگراوەندەکانی ژیاندا (تاکە کەسی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، دارایی، دینی و کۆمەڵگا) چاکسازیی و پەروەردە بکات. بە وتەی ئیمام غەزالی (ئەحکامی فیقهی بۆ پاراستن و ئاگاداریکردن لە پێنج بەرژەوەندییە، کە کۆمەڵێك لە پێویستییەکانی (رۆحی و جەستەیی) مرۆڤەکانی تێدا کورت دەبێتەوە. ئەو بەرژەوەندییانە بریتین لە:

١ـ بەرژەوەندیی دین.

٢ـ بەرژەوەندیی نەفس.

٣ـ بەرژەوەندیی هزر.

٤ـ بەرژەوەندیی نامووس.

---

١- عبدالكريم زيدان، السنن الالهية في الأمم والجماعات والأفراد في الشريعة الاسلامية.

٥- بەرژەوەندیی سامان.

ئەگەر سەرنجی سەرانسەر فیقهـ بدەیت، بۆت دەردەکەوێت کە هەموو ئەحکام و دەستوورەکانی، گرەنتیی پاراستن و هێشتنەوەی ئەم بەرژەوەندییانەیە.[1]

بە سەرنجدان لەم سوودانە کە زانستی فیقهـ هەیەتی، دەتوانرێت پەیوەندیی ئەم زانستە لە سەدا سەد ئاینییە، لەگەڵ زانست و زانیاریی مرۆییدا بهێنرێتە پێشچاو، واتە جگە لە پەیوەندییەك لەگەڵ (نحو، صرف، معاني، بديع، أصول الدين، أصول الفقه، علوم القران، علوم الحديث)دا هەیەتی، لەگەڵ پێنج زانستی تردا پەیوەندیی زۆر نزیکی هەیە:

١- زانستی ئاینناسیی تەتبیقی (پراکتیکی).

٢- زانستی دەروونناسی.

٣- زانستە هزرییەکان، وەك لۆژیك و فەلسەفەی کۆن و نوێ.

٤- زانستە کۆمەڵایەتییەکان.

٥- زانستە داراییەکان.

لەم وتارەدا هەوڵ دەدەین ئاماژە بدەین بە پەیوەندیی زانستی فیقهـ لەگەڵ زانستە جۆراوجۆرەکاندا.

أ- زانستی زمانی عەرەبی: وەك (دەنگناسی –فۆنەتیك–، صرف، نحو، معاني المفردات) تا لەم رێگەوە خوێندکاری فیقهـ بەڵگەکانی (پیت، واژە و ڕستە) بناسێت، تاکو لە ئەنجامدا توێژینەوەی دەقە دینییەکان و وتارە فیقهییەکان بۆی دەست بدات.

ب - زانستی قورئان و تەفسیر: ئەوەی زانایانی کۆن و نوێ بە پەیوەندی لەگەڵ قورئان و لە زانست و زانیارییەکان باسیان کردووە، بۆ فەقیهـ لە دواهاتی هەڵگۆزیندا پێویستیی سەرەکیی هەیە، چونکە بە هۆی ئەوانەوەیە دەتوانێت پەردە لەسەر ئایەتەکان لابەرێت.

---

١- د. علي رضا فيض، مبادىء الفقه والأصول، ص١١٩.

زانستی قورئان لە ناسینی کۆمەڵێك بابەتدا کورت دەبێتەوە کە بەسەریەکەوە لە شەش جۆر زانستدا شایانی کۆبوونەوەیە.

١ـ زانستی چۆنیەتی هاتنە خوارەوەی قورئان: لە رووی (هۆکار، شوێن، کات)ی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان.

٢ـ زانستی بەڵگەکان: کە بریتییە لە دیاریکردنی (خوێندنەوەکانی متەواتر، ئاحاد، شاز، خوێندنەوەی پەیامبەری مەزن ﷺ، ڕاوییان و حافزانی قورئان).

٣ـ زانستی چۆنیەتی خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان: ناسینی (وەقف، ئیبتیدا، ئیمالە، مەد، تەخفیفی هەمزە و ئیدغام) لەخۆ دەگرێت.

٤ـ زانستی ناسینی زاراوەکان: ناسینی (غەریب، موعرەب، مەجاز، موشتەرەك، موتەرادف، ئیستیعارە، تەشبیه) لەخۆ دەگرێت.

٥ـ زانستی واتاکانی پەیوەست بە ئەحکام: وەکو زانینی (خاص و عام، مطلق، مقید، مجمل، مبین، صریح و مؤول، منطوق، مفهوم، ناسخ، منسوخ، محکم، متشابە).

٦ـ زانستی واتاناسیی پەیوەست بە زاراوەکان: وەکو (فصل، وصل، قصر، ئیجاز و اطناب و مساوات).[١]

ئەم دابەشکردنە هی سەردەمانێکە کە زانستی قورئانی لە حاڵی گیرساندا بوو، بەڵام ئەمڕۆکە زۆربەی زانست و زانیارییە مرۆییەکان خراونەتە خزمەت تەفسیر و لێکدانەوەی ئایەتە قورئانییەکان، لەوانە زانستی پزیشکی، ئەندازیاری، ئەستێرەناسی، لەوانەیە بتوانین بڵێین کە (بورهانی زەرکەشی و ئیتقانی سیوتی و مەناهیل عیرفانی زەرقانی) لە باشترین سەرچاوەکانی زانستی قورئانی هەژمار دەکرێن، کە فەقیهەکان یارمەتی دەدەن لە توێژینەوەی ئایەتەکاندا، بە تایبەت ئایەتەکانی ئەحکام.

ج ـ زانستی فەرموودە: ئەم زانستە خەریك دەبێت بە ریزبەندیی حەدیسەکانەوە، لە رووی (صحت، ضعف، حسن، اسناد، ارسال، عضل، منکر) بوونەوە و پلە و بەهای

---

١- جلال الدين السيوطي، الاتقان في علوم القرآن، ج١، ص١٧ـ ١٨.

هەریەك لە جۆرەكانی حەدیس و سەرئەنجام شێوازی بەڵگەسازی و بەڵگەیی بوونی، دیاری دەكات، چونكە فیقهـ پشتبەستنێكی گشتیی هەیە بە سوننەت، لەبەرئەوە پەیوەندییەكی توندی لەگەڵ زانستی فەرموودەناسییدا هەیە.

د- زانستی كەلام (Theology): لە فیقهدا لە چۆنیەتی (ئەرك) قسە دەكرێت و ئەمە وەستاوە لەسەر ئەساسی ناسین و توێژینەوە لە خودی ئەرك و فەلسەفەكەی و گرنگیی پابەندبوون بە یاسای خوایی، كە زانستی كەلام باس كردن سەبارەت بەمەی لە ئەستۆ گرتووە.

هـ - زانستی اصول فیقهـ: فیقهـ زانستێكە كە پێویستی بە بەڵگەسازی و بەڵگە هەیە، لەبەرئەوە نیازی زۆری بە زانستی ئوصول هەیە، چونكە ئەم زانستە بریتییە لە لۆژیك و پایە و كۆڵەكەی فیقهـ.

و- زانستی لۆژیك (Logic): دەزانین لۆژیك بە باسكردن لەسەر پێناسە و بەڵگەسازییەوە خەریكە، لە زانستی فیقهیشدا هەندێك دەستەواژە و چەمك هەیە كە پێویستیان بە پێناسەیە. لە فیقهدا مەسەلەی زۆر هەیە كە دروستی و بەهاكانیان شوێنی پرسیارن و پێویستیان بە بەڵگەسازییە. كەواتە زانستی لۆژیك، رۆڵی سەرەكیی لە تێگەیشتنی قسە و میتۆدی فەقیهەكاندا هەیە.

تا ئێرە ئەوەی بە زانستی فیقهەوە پەیوەست بوو، زانست و زانیارییە ئیسلامییەكان بوو، كە لە فێرگە و قوتابخانە كلاسیكییەكانی ئێمەدا پێوەی خەریك دەبن و فێربوونی ئەوان بە مەرجی پێویست بۆ فێربوونی فەقاهەت و ئیجتیهاد هەژمار كراوە. بەڵام ئەمڕۆ كە فەقاهەت زیاتر فراوان بووە، دەبێت قبوڵ بكەین كە فیقهـ لەگەڵ زانستی مرۆییدا بەگشتی، پەیوەندیی بەدەستهێناوە، بەجۆرێك كە فیقهی هاوچەرخ ناتوانێت و نابێت بە زانیاریی كۆن و كولتووری رابوردووەوە بڕواتە سۆراخی دەقەكان و بابەتەكان، ئەگەر وەها بكات، فیقهێكی چەقبەستوو و بێ جووڵە بە كۆمەڵگای موسڵمانان دەسپێرێت. فیقهێك كە ناتوانێت سەرنج رابكێشێت و توانای بونیادنانی تاك و كۆمەڵگای هەبێت. بە پێچەوانەوە ئەگەر بتوانێت لە زانیاریی نوێ و بابەتی نوێ و تەكنەلۆژیای نوێ زۆرترین

سوود وەربگرێت و نەوەی نوێ بە دەربڕینێکی نوێ و دەرخەر قسە لەگەڵدا بکات، لەم حاڵەدایە کە (مەولانا جەلالەددین) دەتوانێت بە دەربڕینەکانی، ابن الوقت، واتا کەسی دیاری رۆژگاری خۆی بێت.

لە بەشە زۆر و جۆراوجۆرەکانی فیقهی ئیسلامی، ئەو بابەت و وتارانە دەست دەکەوێت کە هەبوونی ئەم پەیوەندییە پێویست دەکات، بۆ نموونە تایبەت بە مامەڵە لەگەڵ ئەهلی کیتابدا، کە بەشێکی فراوان لە ئایەتە قورئانییەکان و بەشێکی زۆر لە حەدیسەکانی پێغەمبەر ﷺ بەوەوە تایبەتە، خوێندنەوەی بەرهەمی ئایینناسانی نوێ، بۆ فەقیهەکانی دەتوانێت زۆر رێگاکەرەوە بێت، چونکە بەهۆی ئەو بەرهەمانەوە راستیی زۆر سەرنجڕاکێش پەیوەست بە ئاینە ئاسمانییەکان و ئاینە مرۆییەکانمان بۆ دەردەکەوێت. کە لە چەسپاندنی ئەحکامی ئەهلی کیتاب بەسەر بەڵگەکانیدا و دیاریکردنی بەڵگەکانی ئەهلی کیتاب، زۆر بە سوود دەبێت.

فەقیهەکان تایبەت بە (صابئین) کە چ دین و بیروباوەڕ و هەروەها چ حوکمێکیان هەیە لەگەڵ یەکدا، جیاوازن، ئایینناسی تەتبیقی، دەچێتە نێو ئەم گرووپە ناوبراوە و لە نێو توێژینەوە لە بیروباوەڕ و نەریتی مەزهەبییان، گوزارشت دەدات بە فەقیهەکان، کە کام یەك لە ڕای فەقیهەکان نزیکتر بەڕاستیی بزانن.[1]

نموونەیەکی تر لە بەشی زەکاتدا، ناکۆکیی فەقیهەکانە لە حوکمی (دراو) کاغەزی دراویدا، ئایا ئەمانە هەژمار بکەین و وەك پشتگیریی ئاڵتون و زیوو لەبەرچاوی بگرین، یاخود خۆیان بە ناونیشانی بنەما دابنێین؟ لەبەرئەوە دەبێت فیقهی سەردەمییانە سەیرێکی زانستی ئابووری و سیستەمی دراوی نێودەوڵەتی بکات، تاکو چۆنیەتی ئەم جۆرە شتانە بناسێت، ئەوکاتە بە دەرکردنی حوکمی شەرعییەوە لەسەر بنەمای دانراو خەریك بێت. کۆمەڵگای مرۆڤایەتی سێ جۆر سیستەمی دراوی (النظام النقدي)یان ناسیوە:

---

١- سید سابق، فقه السنة، ج٢، ص٢٣٩ـ ٢٤٠.

(سیستەمی ئاڵتون، سیستەمی گۆڕینەوە بە ئاڵتوون، سیستەمی دراوی ئیلزامی).[1]

ئەمڕۆ جیهان لەگەڵ سیستەمێکی نوێتردا ئاشنا دەبێت کە هەمان سیستەمی (پارەی سەرڕێژە)[2] کەوایە پێویستە فیقهی نوێ بە سەرنجدان لە دەستکەوتە پسپۆڕییەکانی زانستی مرۆیی و سروشتی، بڕواتە سۆراخی بابەتە رووخراوەکان لە شوێنی باسەکەدا.

## ١ـ ٣ـ ٩ نوێبوونەوە لە تەفسیری دەقە دینییەکاندا:

مەبەستی ئێمە لە دەقە دینییەکان، ئایەتەکانی قورئان و حەدیسی پێغەمبەرە ﷺ:

کەسێك کە خولیای چاکسازیی دینی هەیە، هەمیشە کەسێکە کە پابەندە بە بنەما و بۆچوونەکانیەوە و ئەو خەونە لەسەریدایە کە ژیانێکی نوێ ببەخشێت بە پیرۆزییەکانی دین، واتا دەقەکانی دین.

لە راستییدا پێکهاتەی دین بریتییە لە خودی ئەحکام و زانیارییە دینییەکان، کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەدەستمان گەیشتوون. ئەم پێکهاتەیە کاتێك بوون پەیدا دەکات کە لە کۆمەڵگادا ئاراستە بکرێت، لە کۆمەڵگادا دامەزراوەکان لەسەر بنەمای ئەو دروست ببن. کەواتە دەقەکانی قورئان و سوننەت هەم لە پێکهاتەی دین و هەم لە بوونی دیندا، رۆڵێکی کاریگەر و بونیادنەریان هەیە، ئایەتەکانی قورئان و حەدیس هەڵبەت دەستکاری ناکرێن، واتە ئەوان لەلایەنی زاراوە و واتاوە هەمان ئەوانەن کە خوداوەند لە رێگەی وەحییەوە ناردوویەتی و کەسێك ناتوانێت لێیان زیاد بکات یان لێیان کەم بکاتەوە. کەوایە ئەوی لە رووی واژەییەوە ناوی (وەحی)یە، جەوهەرێکی راستەقینە و ماهییەتی دین و فەرمانێکە سەروتر لە کات و شوێن و ناچێتە نێو یاسای گۆڕانەوە. کۆتا مرۆڤ کاتێك لەگەڵ ئایەت و حەدیسەکاندا مامەڵە دەکات و لەگەڵیاندا هەڵسوکەوت دەکات،

---

١- دکتۆر حسین عمر، مبادئ المعرفة الاقتصادية. ل٢٩٨، ذات السلاسل، كويت، چاپی یەکەم، ١٩٨٩.

٢- سەرڕێژ: مەبەست شناوەرە، واتە پارەکە بۆ خۆی خاوەنی نرخە بەپێی توانای کڕین و کێبڕکێ لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی بازاڕدا و بەهاکەی سەبارەت بە پارەکانی تر لە گۆڕاندایە.

ناچارە بە توێشوویەك لە زانیاریی پێشینان و هەواڵی هاوڕا لەگەڵ شوێن و كاتدا خەریك بێت، تاوەكوو تێگەیشتنێك بە دەست دەهێنێت كە بێگومان لە تێگەیشتنی ئەوانی تر جیاوازە و لە تێگەیشتنی رابردووان نوێترە. دەق هەمان دەقە، بەڵام تەفسیركردنیان تووشی گۆڕان و كامڵبوون دەبێت.[1]

چەمكی دەق لای فەقیه و ئوصولزانەكان ئەڵبەت تایبەتترە لەو چەمكەی لای زمانناسان و موفەسیرینە، چونكە مەبەستی فەقیهەكان لە دەقەكان، ئەو دەقانەن كە بە پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانەوە خەریك دەبن، هەمان پەیوەندی كە بابەتی یاسا مرۆییەكانیشە، بەو جیاوازییەی كە دەقە شەرعییەكانی قورئان و سوننەت پێچەوانەی دەقەكان و یاسای مرۆیی، دەقی جێگیر و سەربەخۆ لە ڕێڕەوی كامڵبوونی دەقەكان لە مێژووی یاسادایە، واتا دەتوانرێت دەقەكانی قورئان و سوننەت بە دیدێكی رووت لە مێژوو و جیا لە شەریعەتەكانی رابردوو بخرێتە شوێنی باسەوە و تەنها بە سوودوەرگرتن لە واتای زاراوە و هەڵگۆزینی حوكم و یاسای لێ بكرێت.[2]

فەقیه و ئوصولزانەكان بە تێبینیكردنی ئەم بنەمایە، لە هەمان سەرەتاوە بە چاودێرییەكی تایبەتەوە چوونەتە سۆراخی دەقە شەرعییەكان، جگە لە بڕوابوون بەوەی كە فیقهی ئیسلامی یاسایەكی بونیادییە لەسەر دەقەكان، ئەم دەقانە زۆرتر گشتی و نەمرن، كەسی فەقیه لە پەیداكردنی حوكمی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكاندا یارمەتی دەدات. ئەوانەیان بە جۆرێك داناوە كە بۆ داهاتووەكان ڕێنماییكەر و ڕێكەرەوە بێت. ئەم ریزبەندییە لە سەرەتادا ئیجتیهادێكی سەركەوتوو بووە و ئێستاكە ڕوونكەرەوەی پێشكەوتنی زانستی ئوصول و نووسینەكانە لە مێژووی ئیسلامدا، پێشڕەوانی ئەم كاروانە بەو جۆرەی كە ئاشكرایە، پێش ئەوەی تەماشای رابوردوو بكەن و بە كەلەپووری پێشین قایل بن، چاویان لە داهاتوو بووە و لە ئەنجامدا داهێنەر بوون. لۆژیكی

---

١- حسن یوسفی اشكوری، نوێگەرایی ئایینی، گفتوگۆ دەربارەی سرووش، ل٩٦.

٢- د. محمد شریف احمد، نظریة تفسیر النصوص المدنیة، ص٣١-٣٢.

خوێندنەوەی دەقیان داڕشتووە و چۆنیەتی ڕێکخستنی دەقەکان لەگەڵ هەبوونی دژایەتییان و جیاوازی لە خوێندنەوەکانیاندا، بۆ هەمیشە بە یادگاری جێهێشتووە.

شێوازی بەکارهاتووی ئاشکرای ئەوان وەها بوو کە هەر زانایەك بتوانێت بۆچوونی ئەوانی تر ڕەخنە لێ بگرێت و پێداچوونەوە بکات بۆ بەرهەمەکانیان و بۆ خۆی شتی نوێ بێنێتە ئاراوە، هیچ کەسێکیش (جگە لە تەقلیدپیشەکان و دەمارگیرەکان) لە کارەکانیاندا بیانوو نەگرێت و تاوانباریان نەکات.

ئێمە لە هەوڵدانێکدا لە تەفسیری رابردوان، کە پراکتیکییانە لە نیوەی دووەمی سەدەی دووەمدا نووسراوە، دوو جۆر لە باسەکان دەبینین:

١ـ ئەو نووسراوانەی کە خەریکن بە بنەماکانی تەفسیری کەلامی خواییەوە.

٢ـ ئەو نووسراوانەی کە گرنگی دەدەن بە مەرجەگانی هەڵگۆزین لە کەلامی خوایی.[1]

هەرچەند ڕیشە و دەسپێکردنەکانی ئەم دوو جۆرە، لە سەرەتای ئیسلام و قۆناغی خولەفای راشیدین بە شێوازی زارەکی و سەرەتایی دەبینرێت.

بێگومان شێوازی وەرگرتنی گرووپەکانی کەلامی و سیاسی، نووسینی لەم جۆرەی زووتر و زۆرتری پێویست کردووە و بە زۆربوونی دەرگیریی نێوان گرووپەکان، ئەم کارە پەلەکردنی زۆرتری لەخۆ گرتووە.

جێگای تێبینییە کە لە جۆری یەکەم موفەسیرین و لە جۆری دووەم فەقیهەکان و ئوصولییەکان بونیادیان ناوە و گەشە و فراوانبوونیان پێبەخشیوە. بەڵام بەو جۆرە کە روونە، بەردەوام موفەسیرین لە خزمەت فەقیهەکاندا بوون و کاریان سازکردنی باکگراوندێك بووە بۆ ئیجتیهادی ئەوان.

لە سەرەتادا زۆرترین هەوڵەکانی تەفسیری دەقەکان، سەرنجی لەسەر قورئان بووە. لە سەرەتای قۆناغی کۆکردنەوەدا لەگەڵ پەرتووکێك لە (مقاتل بن سلیمان) کۆچکردووی

---

١- د. محمد عابد الجابری، بنیة العقل العربي، ص٢٠.

١٥٠ی كۆچی، بە ناوی (الاشباه والنظائر في القرآن الكريم) رووبەڕوو دەبینەوە، کە لەوێدا زۆرتر بە جۆراوجۆریی واتاکانی زاراوەی قورئانییەوە خەریك بووە.[١]

پاش ئەو (ابو زکریا یحیی بن زیاد فراء) کۆچکردووی (٢٠٧)ی کۆچی دێت، کە لە (معاني القرآن) بۆچوون دەخاتە سەر (دیاردەی مەجاز ـ گەشەوەرگرتنی وتاری قورئانی).[٢]

بەڵام گرنگترین بەرهەم لەم قۆناغەدا و لەم ڕێگەدا، لەوانەیە پەرتووکی (مجاز القرآن) ئەبو عوبەیدە مەعمەری کوڕی موسەننا (کۆچکردووی ٢١٥ کۆچی) بێت. ئەو بەم پەرتووکە ڕێگای بۆ زانایانی جێنشینی خۆی هەموار کرد تا یاسا و بنەماکانی تەفسیرکردنی قورئان دەربهێنن و گەشەی پێ بدەن. دەگوترێت هۆکاری سەرەکیی دانانی پەرتووکی ناوبراو ئەمە بووە کە کەسێك لەو دەپرسێت بۆچی لە ئایەتی (إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ * طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُؤُوسُ الشَّيَاطِينِ) (الصافات: ٦٤ـ ٦٥)، درەختێك کە ئاشکرایە بە سەری شەیتان کە نادیارە، لێکچوێنراوە؟ لەکاتێکدا لێکچواندنێکی لەم جۆرە لە نێو عەرەبەکاندا بێ پێشینەیە؟ ئەبو عوبەیدە لە وەڵامدا دەڵێت قورئان لە قسەکردن لەگەڵ خەڵکیدا شێوازێکی لەپێش گرتووە کە بۆیان جێی تێگەیشتن بێت و هەڵبەت لێکچواندنی ئاشکرا بە نادیار لە نێوان عەرەبەکاندا پێشینەی هەیە و ئەو پەرتووکەی لەسەر ئەم بنەمایە نووسیوە کە عەرەب بە دوو شێوە واتا دەگەیەنن بە گوێگر، شێوازی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، ئەو شێوازی ناڕاستەوخۆ بە (مەجاز) خوازراو ناو دەنێت.[٣]

هاوکات لەگەڵ ئەم پێشڕەوانەدا لەگەڵ زانایەکدا ڕووبەڕوو دەبینەوە بە ناوی (محمد بن ادریس الشافعي) لە (٢٠٤)ی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە. کە جگە لە لێهاتوویی لە

---

١- مقاتل بن سليمان، الاشباه والنظائر، تحقيق عبدالله محمود شحاتة، القاهرة، ١٩٧٥.

٢- ابو زكريا يحيى بن زياد الفراء، معاني القرآن، لە سێ بەرگدا، القاهرة، ١٩٧٣.

٣- ابو عبيد معمر بن المثنى، مجاز القرآن، تحقيق محمد فؤاد سزين، القاهرة، ١٩٥٤.

زمان و ئەدەبیاتی عەرەبدا و ئاشنایی تەواو لەگەڵ شێوازەکانی قسە لە نێوان عەرەبە دەشتەکییەکان، بە بۆچوونێکی فیقهی و یاسایی لە قورئان نزیك دەبێتەوە. جگە لە بنەماکانی تەفسیری قورئان، گرنگیی زۆر بە شێوازەکانی هەڵگۆزینی حوکمی شەرعی لە ئایەتەکاندا دەدات. بە کورتی بۆچوون و تەفسیرە ئیجتیهادییەکانی خۆی لە (رسالة)یەکدا بەجێ دەهێڵێت کە ئەمڕۆکە لە هەر شوێنێك قسە لە زانستی ئوصول دێتە ناو (رسالة)ی شافیعی، دێتەوە بیر.

یەکێکی تر لە پێشڕەوانی توێژینەوەی دەقەکانی قورئان (ابو عثمان عمرو بن بحر جاحظ، کۆچکردووە ٢٥٥ﻫ). ئەم لەم ڕێگایەدا دوو کتێبی تایبەتی (نظم القرآن) و (آي القرآن)ی هەیە. ئێمە ئەم دوو کتێبەمان لەدەستدا نییە، یەکەمیان (ابن الندیم) لە فێهرستدا و دووەمی خودی جاحظ لە بەرهەمی (الحیوان) دا باسی کردووە، جاحظ پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ (تێگەیشتن) و گرنگیی پێ بدات، بۆ (تێگەیاندن) گرنگیی زۆرتر قایلە. تێگەیاندنی گوێگر و بڕوای ئەو و گفتوگۆ کردن لەگەڵ کەسی بەرامبەردا و بێ وەڵام هێشتنەوەی ئەو.

شێوازی ئەو بە پێچەوانەی شافیعییەوە، تەفسیرکردنی دەقەکان نییە، بەڵکو دیاریکردنی بنەمایەکە لەسەر ئەساسی ئەو، وتاری قورئانی ئەنجامی دەبێت. لەم شێوازەدا ـ گوێگر ـ بوونێکی بەرچاوی هەیە ـ لەکاتێکدا گوێگر لە سیستەمی شافیعیدا بە تەواوی ونە، شافیعی لە بریتی (گوێگر) بە (بێژەر) گرنگی دەدات.

هەرچەند پەرتووکی (حیوان) هێما و زانیاری لەبارەی ڕوونکردنەوەی قورئانییەوە لەخۆ دەگرێت، بەڵام زۆرترین بۆچوونە ڕوونکارییەکانی لە پەرتووکی (البیان والتبیین)دا دەردەهێنریت، بەتایبەت کە ئەم پەرتووکە لەسەر نەخشەیەکی لۆژیکیی شاراوە، پرۆسەی ڕوونکردنەوە و مەرجەکانی دەربڕینی قسە و هەلومەرجی وەرگرتن ڕادەگەیەنێت.

لەم بوارەدا پێویست دەکات ئاماژەیەك، هەرچەند کورتیش بێت، بە نیشانەکانی شێوازی (جاحظ)مان هەبێت، تا بزانین کە هەڵسوکەوت و هەڵوێستی زانایان لە بەرامبەر دەقەکانی قورئان بە درێژایی مێژوو و بە تێپەڕبوونی کات، لە گۆڕان و تەواوبووندا بووە.

١ـ روونکردنەوە و رەوانیی زمان: (جاحظ) بە پشتبەستن بە بەڵگەی قورئانی، لەوانە چیرۆکی حەزرەتی موسا کاتێك فەرمانی پیِّ کرا بۆ بانگهێشتکردنی فیرعەون بۆ پەیامی خوایی، بە گرنگیی سەلامەتیی زمان لە گرفتەکانی قسە وەك (بێهودە قسەکردن، زۆر گوتن، بێتوانایی، گرێی زمان) ئاماژە دەکات، بڕوای وەهایە ناردنی پێغەمبەران وابەستەیە بە روونکردنەوە و باس کردن، واتا تێگەیاندن و تێگەیشتنی پەیام.[١]

٢ـ روونکردنەوە و هەڵبژاردنی واژەکان: هەروەك ئەوەی کە روونکردنەوە بە ڕەوانیی زمان و قسەزانییەوە پەیوەندیی هەیە، بە هەمان شێوە بە شێوازی هەڵبژاردنی زاراوەکانیشەوە پەیوەستە. مەبەست لەم قانونمەندییە ئەوەیە کە زاراوە دەبێت هاوڕا بێت لەگەڵ پلەیەکدا (مقام)، ئەو لەم بارەیەوە بە قورئان بەڵگەی هێناوەتەوە و دەڵێت (ئەی بۆچی نابینیت کە خوای گەورە لە قورئاندا زاراوەی (جوع) برسێتیی لە هەڵوێستی سزادا، یان لە هەڵوێستی هەژاری و بیِّ دەسەڵاتیدا باس کردووە و خەڵکی لە کاتی سەلامەتی و بەدەسەڵاتیدا لە جیاتی زاراوەی (تعب) لە زاراوەی (جوع) سوود وەردەگرن. واژەی (مطر) لە قورئاندا تەنها لە هەڵوێستی تۆڵەدا دەدۆزیتەوە، لەکاتێکدا خەڵکی عەوام و زۆرێك لە کەسانی تایبەتیش، جیاوازی لە نێوان (مطر) و (غیث)دا ناکەن.[٢]

٣ـ روونکردنەوە و خستنەڕووی واتا: لە دوو چوارچێوەکەی سەرەوەدا، (جاحظ) پرۆسەی روونکردنەوەی لە دوو ئاستی پیتەکان و زاراوەکاندا خستووەتە ژێر لێکۆڵینەوە، لە ئاستێکی بەرزتردا کە هەمان بەڵگەیە، بەم خاڵە ئاماژە دەکات کە

---

١- الجاحظ، البيان والتبيين، ج١، ص١١.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ج١، ل١٨ـ ١٩.

(واتاکان لە سینەی خەڵکدا شاراوە و پەنهانن و بەهۆی باسکردن و هەواڵ لێدانیانەوە و بەکارهێنانیان، زیندوو دەمێننەوە) بەشێوەیەکی سروشتی خستنەڕووی ئەم واتایانە بەپێی بەڵگەی روون، ئاماژەی راست و کورتکردنەوەی باش و دەستپێکی وردبینانە دەبێت)[1].

٤ـ روونکردنەوە و رەوانبێژی: تا ئێستا سێ مەرج بۆ بەرهەمهێنەری وتاری قورئان بوونی هەیە (تەندروستبوونی زمان، هاوسەنگیی نێوان زاراوە و پێگە، ئاشکرایی و روونی) جگە لەمانە مەرجێکی تر پێویستە تاکو روونکردنەوەی قورئانی کامڵ ببێت، ئەویش بریتییە لە هاوڕایی زاراوە و واتا پێکەوە، کە ئەم کارە بە واتای رەوانبێژییە، (جاحظ) تایبەت بەمە دەڵێت: (قسە شایستەی تەواوی رەوانبێژی نابێت، ئەگەر بە جۆرێك نەبێت کە زاراوە لەگەڵ واتا و واتا لەگەڵ زاراوەدا نەکەونە رکابەرییەوە، واتە گەیشتنی واتاکەی هاوکات یان پێش گەیشتنی زاراوەکەی بە گوێچکەی بێت)[2].

شایانی باسکردنە کە مەبەستی (جاحظ) لە زاراوە نەك زاراوەی تاك یان واژەی سەربەخۆیە، بەڵکو هەمان (وتەی رێکخراو)ە، شتێك کە جورجانی بە نەزم ناوی دەبات.[3]

٥ـ روونکردنەوە توانا دەئافرێنێ: بەوپێیەی کە (جاحظ) تەنها ئەدەبزان نەبووە، بەڵکو لە پەنای ئەدەبیاتدا سەرقاڵی زانستی کەلام بووە کە دەستەیەك لە موعتەزیلە خراونەتە پاڵی، لەبەرئەوە تەنها بە لایەنی (جوانی، هونەری، رەسایی قسە) قایل نابێت، بەڵکو سەروتر لەوە، دەگەڕێتەوە بۆ گرنگیی ئەو کاریگەرییەی کە وتە لەسەر گوێگر دایدەنێت، هەروەها ئەو توانایەی دەیبەخشێت بە بێژەر، کە رۆڵی روونکردنەوە شتێك نییە جگە لەمە، کە راستیی ئاشکرا و باتڵ وەکو راستی پیشان دەدات، هەمان ئەو

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ج١، ل٥٥.

٢ -جاحظ، سەرچاوەی پێشوو، ج١، ل٨١.

٣- الجابري، بنية العقل العربي، ص٣٠.

رۆڵەی کە (جاحظ) بۆ روونکردنەوە قایلە، لە حاڵێکدا کە ئەنجام بدرێت، بەسەریدا (قول فصل ـ قسەی جیاکەرەوە) (فصل الخطاب) ناوزەد دەکرێت.

جاحظ لە (عەمری کوڕی عوبەید) یەکێك لە پێشڕەوانی موعتەزیلە، دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: (ئەگەر بتوانی بەڵگەی بوونی خودا لە ئاوەزی رووڵێنراواندا (مكلفان) جێگا بکەیتەوە و رەنجی گوێگرەکان کەمبکەیتەوە، بە واژەکانی خۆشئاواز لە گوێچکە و قبوڵکراو بۆ زیهن، ئەم واتایانە لە زیهنی خوازیاراندا بە مەبەستی زووتر وەرگرتنیان و لابردنی سەرقاڵییەکان لە دڵیاندا، بە سوودوەرگرتن لە پەند و قسەی باش و بەپێی قورئان و سوننەت بڕازێنیتەوە، لەم حاڵەدا (فصل الخطاب)ی پێ بەخشراوە.[1]

بەڵێ روونکردنەوە لە دیدگا و رۆڵی کەلامییەوە دەسەڵات دروست دەکات، دەسەڵاتێك کە بێژەر بەسەر گوێگردا بەکاری دەهێنێت، دەسەڵاتێك لە حوکمڕانیی دەسەڵاتدارێك بەسەر خەڵکدا کەمتر نییە، لە قورئاندا هاتووە (وَشَدَدْنَا مُلْكَهُ وَآتَيْنَاهُ الْحِكْمَةَ وَفَصْلَ الْخِطَابِ) (ص: ٢٠). هەڵبەت رێکەوت نییە کە لە ئایەتێکدا و لەناو کۆی باسکردنی بارودۆخی پێغەمبەرێکدا بە ناوی داود، دەسەڵات و حیکمەت و روونکردنەوەیەکی تەواو ڕوون و بەتوانا لە پەنای یەکدا بن)[2].

تێبینی دەکرێت کە بە مەبەستی تەفسیر و ناسینی دەقەکان، هەموو زانایانی ئیسلام، بەتایبەت زانایانی (صرف، نحو، بلاغة، فقه و أصول) بە هاوکاری لەگەڵ یەکتردا سەرقاڵ بوون، بە جۆرێك لە خوێندنەوەی دەقدا هەماهەنگ بوون و هەن کە توانیویانە:

**یەکەم:** هۆکاری نیازمەندبوون بە تەفسیر بە باشی بخەنەڕوو، کە بە زۆری سێ هۆکارن:

١ـ ئاڵۆزییەکان و ناڕوونی لە دەقەکاندا.

٢ـ دژبوون لە دەقەکاندا.

---

١- جاحظ، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج١، ل٨١.

٢- د. محمد عابد الجابري، بنية العقل العربي، ص٣١.

٣ـ بێدەنگی یان خەریکنەبوونی دەقەکان بە بابەتەکەوە.

**دووەم:** ئاماژەی دەق بۆ دوو جۆری یەکلاکەرەوە و گومان هەڵگر دابەشی بکەن:

١ـ واتا گەیاندنی یەکلاکەرەوە: ئەوەیە کە گریمانەی ناکۆکی تێدا نییە و هەمووان لەسەری هاوڕان.

٢ـ واتا گەیاندنی گومان هەڵگر: ئاماژەیەکە کە ئاوەز پاش هەوڵ و تێکۆشان لە تەفسیر و روونکردنەوەی دەقەکاندا پێی دەگات و شیانەی هەڵەی تێدایە.

**سێیەم:** واتا گەیاندنی دەق بەپێی شوێنی قسەکە دوو جۆرە: ئاماژەی منطوقي[1] و مفهومي[2].

١ـ واتا گەیاندنی منطوقي: بریتییە لە واتای راستەوخۆی زاراوەکان لە شوێنی قسەدا.

٢ـ واتا گەیاندنی مفهومی: بریتییە لە واتای ناڕاستەوخۆ کە لەودیوی زاراوەکانەوە و لە رووی بارودۆخ و هزرەوە دەتوانرێت وەربگیرێت.

**چوارەم:** ئامرازەکانی زمان و ئاوەز: هەم لە ریزبەندیی دەقەکاندا و هەمیش لە خستنەڕووی واتاکاندا پشکیان هەیە، هەردووکیان لە درێژەپێدانی رێگای سەلەف و فراوانبوونی لێتێگەشتنیان لە نێو هەموو زانایاندا، رۆڵێکی بەرچاویان گێڕاوە.

پەیوەستبوونی هزری مرۆڤ لەگەڵ دەقی پیرۆزدا، جۆرێك پاکی بە هزر و ئەو زانستەی کە بە دەستی هێناوە، بەخشیوە. بەم هۆیەوەیە کە لە خەیاڵدانی ئەوانەی کە پەیڕەوی ئەم قوتابخانەیەن، بەردەوام بۆچوونی سەلەف بەسەر هەموو بۆچوونەکانی تردا بەرتریی هەیە. مەبەست لە هەر جۆرە هەوڵێکی زانستی ئەوەیە کە نزیك ببێتەوە لە بۆچوونی سەلەف، سەرچاوەبوونی سەلەف وەکو شێوازی راستییەکی رەهای لێهاتووە کە دەبێت نوێخوازی و نوێبوونەوە بەپێی ئەو سەرچاوانە شێواز بگرێت، ئەگینا ڕەتکراوە و وەرنەگیراوە.

---

١- منطوقي: بێژەیی.

٢- مفهومي: چەمکی.

ئەهلی روونکردنەوە لایەنگریی جیاوازیان لەگەڵ یەك هەیە، کە لەگەڵ هەبوونی یەکبوونیان لەسەر بونیادی سەلەفگەرایی بە ناونیشانی ئەساسی بابەت، بە سەرنجدان لە چۆنیەتی کارکردن و ئاسۆی بیریان، دەبینین چەندین گرووپی سەلەفی لە ئوممەتی ئیسلامیدا بوونی هەیە، بە دەربڕینێکی وردتر، ئوممەتی ئیسلامی لەچەند گرووپی سەلەفی دروست بووە، بەو جۆرەی کە (سید محمد رشید رضا) ئاماژەی پێ دەدات: ڕێگای ئەهلی سوننەت و جەماعەت هەمان ئەو ڕێگایە کە زۆربەی هاوەڵان و زانایان و تابعین و پێشەوایانی حەدیس و فیقه و تابیعی ئەوان، هەیان بووە، تا کەسانێك کە دەستیان گرتووە بە قورئان و سوننەتەوە و بەبێ گۆڕان هەوڵی گێڕانەوەی دەقە روونەکان دەدەن و لە بیدعە و دروەستکراوەکان و ئەو بۆچوونانەی کە هەوەس پەرستان تاشیبوویان، دەیانپارێزن. لە نموونەی پێشەوای شارە گەورەکان (ئەبو حەنیفە، مالیك، شافیعی، ئەحمەد، سوفیانی سەوری، ئەوزاعی، داود،...). لە دواییدا زۆرێك لە موتەکەلیمین خۆیان بە یەکێك لەم مەزهەبانەوە بەستووەتەوە، لە هەندێك بنەمادا پێچەوانەی ئەوان بوون، وەکو هەندێك لە موعتەزیلەی شافیعی، مورجیئەی حەنەفی. لە هەموان نزیکتر بە سەلەف، (ئەشاعیرە)ن، کە زۆربەیان مالیکی و شافیعی بوون و ماتوریدییە کە مەزهەبی حەنەفییان هەبوو.[1]

بە سەرنجدان لەم دیدگایە و بە مەبەستی پارێزگاری لە بنەما و تایبەتمەندییەکان (زانستی بەیان، روونکردنەوە)، زانایانی بواری بەیان یاسا و دەستووری زۆریان بۆ تێگەیشتن و بۆچوونی راست لە دەق داناوە و خستوویانەتە بەردەست داهاتووان. ئەمڕۆ کۆمەڵانی خەڵك دینی خۆیان بە پەیڕەویکردن لەم قوتابخانەیە وەردەگرن.

لە راستییدا زماناسانی وەك (سیبەوەیهی) و (سکاکی) و (کیسائی) و رەوانبێژانی وەك (جورجانی ـ جاحظ) و زانایانی بواری حەدیس، وەك (ابن الصلاح، بوخاری و موسلیم) و موفەسیرانی وەك (بیضاوي، زمخشري) و پێشەوایانی فیقه و ئوصول و تا

---

١- سید محمد رشید رضا، تفسیر المنار، ج٧، ص٥٥٧.

دەگاتە موتەکەلیمین، وەك (ئەشعەری، باقلانی، جوینی، ماتوریدی) کە لە یەکێك لە بەشەکانی زانستدا گەڕاونەتەوە بۆ قورئان و سوننەت، هەموو لە جیهانی (زانستی بەیانی) دا ژیاون و هەناسەیان کێشاوە و ویستوویانە بیرکردنەوە و کردارەکانیان وەك هی پێشین وەها بێت، هەرچەند بە لەبەرچاوگرتنی (جیاوازیی سەلیقە، بۆچوون و هەلومەرجی ژینگەیی) تا ئەندازەیەك ناکۆکیی جوزئی و قۆناغییان هەیە.

لەسەر ئەم بنەمایە هەر موسڵمانێك بیەوێت بڕواتە نێو جیهانی دەقەکان، دەبێت جگە لە ئیمانێکی قووڵ بەو جیهانە، ئەو ئامرازانە ئامادە بکات و خۆی لە هۆکار و مەسەلە ڕێگرەکان بە دوور بگرێت.

الف: ئامرازە پێویستەکان بۆ تێگەیشتنی دەق:

١ـ زمانی عەرەبی: لە لایەنی (وشەکان، تاکەکان، واژەکان، ڕستەسازی، لایەنەکانی ئاماژەی زمانی، واتا –معاني–، ڕوونکردنەوە –بیان–، بەدیع) لەبەرئەوە یەکەمین هەنگاو بەرەو جیهانی دەقەکان بریتییە لە ناسینی واتای واژەکان و چۆنیەتی بەکارهێنان و سوود و ڕۆڵی پێشخستن و دواخستنیان.

٢ـ هۆکارەکانی هاتنە خوارەوە: بۆ ئەوەی لە ڕووی ئاماژەی مێژوویی و واتاییەوە ئایەتەکان ڕوونتر و وردتر بێت، بەپێویست دەزانرێت کە هەلومەرج و هۆکارەکانی هاتنەخوارەوەی قورئان ئاشکرا بکرێت. بەمەبەستی ئەوەی کە دەقەکان لە وەها بارودۆخێکی لێك جودا، جارێکی تر بخرێنە بواری چەسپاندن و لە ڕێڕەوی ژیاندا بوونیان هەبێت.

٣ـ زانستی ئوصولی فیقە: هەمان ئەو زانستەی کە سوودی تێگەیشتن و مەودای بەکارهێنانی دەقەکان دیاری دەکات و بنەما و یاسای وردبینانە بۆ نووسینی بەڵگە و ڕێکخستنیان، سنوورداریان دەکات، خوێنەر لە زاراوەوە بەرەو واتا ڕێنمایی دەکات، جۆری ئاماژەی زاراوە لەسەر واتا و پەیوەندیی نزیکی ئەو دوانە پیشان دەدات، چونکە لەوانەیە یەك زاراوە چەند واتا (زاراوەی هاوبەش) و چەند زاراوە یەك واتا (هاومانا) یان هەبێت.

ئاماژەی زاراوە: بەپێی ئاماژەی گشتی واتای (پڕاوپڕ) و بەپێی ئاماژە بۆ بەشێك لە واتای (ناوەکی) و بەپێی پێویست واتای (التزامي)یە. ئەمانە بابەتگەلێکن کە پەیوەندیی نێوان لۆژیك و فیقھ و ئوصول ڕووندەکەنەوە.

ئەم زانستە جگە لە دیاریکردنی جۆری پەیوەندیی نێوان زاراوە و واتا، چۆنیەتی هەڵگۆزینی حوکمی شەرعی لە بەڵگەی (قورئان و سوننەت) پێگەی ئیجماع و ڕێگاکانی قیاس، واتا بەراوردکاریی نێوان (اصل ـ فرع)مان فێر دەکات، لە هەمانکاتدا گرنگیی ئەم بەڵگەیە بەپێی ئەو لە پێشتریانەی کە لە بۆچووندان، دیار و ئاشکرای دەکات.

دەقەکانی قورئان دوو جۆرن:

١ـ واتا روون: ئەو دەقانەن کە ئاماژەکانیان بۆ واتاکانیان ئاشکرا و بێپەردەن.

٢ـ واتا شاراوە: ئەو دەقانەن کە ئاماژەکانیان بۆ واتاکانیان نادیار و داپۆشراون.

هەڵبەت هەریەك لەم دوو تایبەتمەندییە ڕێژەییە و پەیوەندیی بە (بەهای ئاوەز و زانست و کلتووری خوێنەرەوە هەیە).

زانایان لە نووسینی ئوصول فیقھدا پێنج ڕەوتی تایبەتیان هەیە:

١–ڕەوتی فەقیهەکان یان ڕەوتی حەنەفییە: کە لە تۆمارکردنی بنەمای شێوازی (استقراء Inductions) واتا ڕۆشتن لە جوزئی بۆ گشتی. لەم لایەنخوازییەدا فروعە فیقهییەکان و بابەتە گوازراوەکان لە پێشەوایانی مەزهەبەکانەوە بووەتە بنەمای دانانی یاسا ئوصولییەکان، واتا زانایان کۆمەڵێك یاسایان داناوە کە بە بۆچوونیان هاوڕا بووە لەگەڵ بیری ئیجتیهادی پێشەوایان. لە تایبەتمەندییەکانی ئەم پرۆگرامە سروشتی (کرداری و هەندێتییەتی) کە هەڵبەت دەکەوێتە خزمەت فروعە مەزهەبییەکانەوە و زۆرتر مەیلی بۆ زانستی فیقھ هەیە، وەك لە زانستی ئوصول، بەو جۆرەی کە ئیبن خەلدون لە پێشەکییەکەی خۆیدا ئاماژەی پیێ دەدات:[1]

١- د. عبدالكريم زيدان، الوجيز في أصول الفقه، ص١٧، ابن خلدون، مقدمة ابن خلدون، ص٤٥٥.

له پەرتووكە ئوصولییەكانی ئەم رەوتە دەتوانرێت ئاماژە بەم كتێبانەی لای خوارەوە بكرێت:

١ـ اصول علامة ابوبكر جصاص، متوفي ٣٧٠هـ.

٢ـ اصول علامة ابو زيد ابوسي، متوفي ٤٣٠هـ.

٣ـ اصول فخر الاسلام بزدويي، متوفي ٤٨٢هـ.

٤ـ اصول شمس الأئمة سرخسي، متوفي ٤٨٣هـ.

٥ـ كشف الأسرار بخاري، متوفي ٧٣٠هـ.

٦ـ مختصر المنار لة عبدالله بن أحمد نسفي، متوفي ٧٩٠هـ.[1]

٢ـ رەوتی زانایانی كەلام: ئوصولییەكانی موعتەزیلە، پێشینانی شیعە، شافعییەكان و مالیكییەكان بە گرنگیدان بە رەوتی كەلامی خۆیان، هەوڵیان داوە كە ئوصولی فیقھ لەسەر ئەساسی ئاوەزگەرایی كەلامی بەبێ گرنگیدان بە هاوڕایی دیدگای فەرعیی مەزھەبەكان، دابڕێژن و خوازیاری بەڵگەسازیی هزری و خەریكی دانانی یاساكانی ئوصول بن.

زۆرێك لە پێشەوایانی ئوصول پەرتووكەكانی خۆیان هاوڕا لەگەڵ ئەم شێوازە داناوە، گرنگترین ئەو پەرتووكانەی لە چوارچێوەی كاتی سەدەی پێنجەمدا نووسراون بریتین لە:

١ـ المعتمد: القاضي أبو الحسين محمد بن علي بصري معتزلي، كە ٤٦٣هـ كۆچی دوایی كردووە و لە راستییدا درێژەپێدەری رێگای (القاضي عبدالجبار، متوفى ٤١٥هـ) لە پەرتووكی (العمد) بوو.

٢ـ البرهان، (امام الحرمين عبدالملك بن عبدالله الجويني النيسابوري الشافعي، متوفى ٤٧٨هـ).

٣ـ المستصفى، ئیمام موحەممەد غەزالی، ٥٠٥ی كۆچی.

---

١- الشيخ محمد الخضري بك، أصول الفقه، ص١٠ـ ١١، د. زيدان، الوجيز، ص١٨.

پاش ئەم قۆناغە سەرە گەشتە سەر دوو زانای بەڕێز، کە پەرتووکەکانی سەرەوەیان بە باشترین شێوە کورتکردەوە و بەشێوەی یەك پەرتووك نووسییان:

**یەکەم:** (ئیمام فخرالدین موحەممەد بن عومەری رازی شافیعی، متوفی ٦٠٦ﻫ)، دانەری پەرتووکی (المحصول).

**دووەم:** ئەبولحەسەن عەلی بن ئەبی عەلی، بەناوبانگ بە (سیف الدینی ئامێدی، متوفی ٦٣١ﻫ)، نووسەری بەرهەمی (الاحکام فی اصول الاحکام).

ئەم دوو پەرتووکە لە ڕووی شێواز و لەسەرخۆی و روونیی واژەکانەوە، بوونە جێگای رێزی زانایانی دوایی و بووە هۆی ئەوەی کە دەست بەرن بۆ کورتکردنەوەیان:

بەرهەمەکە یەکەمجار (تاج الدین محمد بن حسن ارموی، متوفی ٦٥٦ﻫ) لە پەرتووکی (الحاصل)، پاشان (محمد بن أبی بکری ارموی، متوفی ٦٨٣ﻫ) لە پەرتووکی (التحصیل) کورتیان کردەوە.

(قاضي عبدالله بن عمر البیضاوی، متوفی ٦٨٥ﻫ)، (منهاج الاصول)ی لەبەر رووناکی (الحاصل) ئەرمەوی دا نووسی، بەڵام ئەم پەرتووکە ئەوەندە ئاڵۆز و داخراوە کە بەبێ شەرحی عەلامە (عەبدوڕەحیم بن حەسەن ئەسنەوی، متوفی ٧٧٢) شایەنی سوود لێوەرگرتن نییە بەو شێوەیە، ئەسنەوی بە باشترین شێوە باس و گفتوگۆی بۆ کردووە.[1]

پەرتووکی (احکام)ی ئامیدی (العلامة ابن الحاجب المالکي، متوفی ٦٤٦ﻫ) کورتی کردووەتەوە بە ناوی (منتهی الوصول و الأمل في علمي الاصول والجدل)ەوە ناوی نا، ئەم کتێبەی جارێکی تر کورتکردەوە و ناوی نا (مختصر المنتهی).

دەستەواژە پوختەکان تا ئەندازەیەکی زۆر لە واژەکانی (منهاج البیضاوي) دەچێت و باشترین شەرح کە لەسەری نووسراوە، شەرحی (قاضي عضد الدین ایجي، متوفی ٧٥٦ﻫ) و کورتترە لە شەرحی ئەسنەوی.

١- الخضري بك، اصول الفقه، ص٨ـ٩. د. زيدان ، الوجيز، ص١٧ـ ١٨.

زانایانی شیعه له سەرەتادا بەم شێوازە ئوصولیان تۆمار دەکرد و لەم لایەنەوە دەتوانرێت بە (الذريعة الى اصول الشريعة، سيد مرتضى، متوفى ٣٣٦هـ) و (عدة الاصول، شيخ الطائفة ابو جعفر الطوسي، متوفى ٤٦٠هـ) ئاماژە بکرێت.

ڕەوتی زانایانی کەلام بەو جۆرەی کە ڕوونە، ڕەوتێکی ئیجتیهادی، بەڵگەسازی، بە تەواوی عەقڵگەرایە و بە گواستنەوە لە ڕابوردووانەوە قایل نابێت، بەڵکو لە بۆچوونی پێشینان ڕەخنە دەگرێت و هەڵیان دەسەنگێنێ، دەمارگیریی مەزهەبی تێدا کەم ڕەنگە و فەرعە فیقهییەکان کەمتر لە لابەلایی باس و بەڵگەسازییەکاندا بەرچاو دەکەوێت، واتا باس لەم ڕەوتەدا بە گشتی تیۆرییە و لێکچووی زانستی کەلامە.

٣- ڕەوتی موتەئەخرین (دواینەکان)، دەستەیەك لە زانایانی موتەئەخیر ویستیان هەردوو پرۆگرامی موتەکلمین و فەقیهەکان پێکەوە کۆبکەنەوە و تێکەڵی بکەن، لەلایەك بە گوزارشتکردنی یاسا و دەستوورەکانی هەڵگۆزینەوە خەریك بن و لە لایەکی ترەوە گرنگی بە ڕوونکردنەوەی لقە فیقهییەکان و ریوایەتی پێشینان بدەن، کە هەم لایەنی تیۆریی زانستی ئوصول و هەم خاڵە ڕەهەندییەکانی پێکەوە کۆبکەنەوە.

ئەم شێوازە زۆرێك لە پێشەوایانی شافیعی، مالیکی، حەنبەلی، جەعفەری، حەنەفی، پەسەندیان کردووە، لە پەرتووکە گرانبەهاکانی ئەم لایەنخوازییە ئاماژە دەدەین بە:

١ـ پەرتووکی (بديع النظام الجامع بين كتابي البزدويي والاحكام) لە (ئیمام مظفر الدين احمد بن علي ساعاتي حنفي، متوفى ٦٤٩هـ) کە بە کۆکردنەوەی دوو پەرتووکی بەزدەوی و ئیحکامەوە خەریك بووە.

٢ـ پەرتووکی (التنقيح) شەرحەکەی بە ناوی (التوضيح) لە (صدر الشريعة عبيدالله بن مسعود بخاري، متوفى ٧٤٧هـ) کە (علامة سعدالدين تفتازاني، متوفى ٧٩٣هـ) حاشیەیەکی فراوانی بە ناوی (التلويح) ی لەسەر نووسیوە.

٣ـ پەرتووکی (جمع الجوامع) لە (تاج الدين عبدالوهاب بن علي بن علي السبكي شافعي، متوفى ٧٧١هـ)، کە دەڵێت پەرتووکەکەی لە کۆی نزیکەی سەد کتێب کۆکردووەتەوە.

٤ـ کتێبی (التحرير، علامة كمال الدين ابن الهمام حنفي، المتوفی ٨٦١ﻫ) کە قوتابییەکەی بە ناوی (محمد بن محمد بن أمير الحاج، المتوفی ٨٧٩ﻫ) شەرحی کردووە بە فراوانی.

٥ـ پەرتووکی (مسلم الثبوت، علامة محب الله بن الشكور، المتوفی ١١١٩ﻫ)، شەرحەکەی بەناوی (فواتح الرحموت) لە (علامة عبدالعلي محمد بن نظام الدين انصاري) کە بە وردەکارترین کتێبەکانی رەوتی موتەئەخرین هەژمار دەکرێت.[1]

٤– رەوتی شاطبی (ئامانجگەرایی): ئەم رەوتە پێچەوانەی پێشوو، بریتییە لەوەی ئەگەر فەقیه دەیەوێت واتا لە زاراوە هەڵگۆزێت، دەبێت ئامانجی گشتیی ئەو لە قووڵایی دەقەکاندا دەربهێنێت و بزانێت کە دانەری پیرۆز (خودا) بە چ مەبەستێك پێغەمبەرانی ناردووە و بۆچی شەریعەتی داناوە و بۆچی لەگەڵ مرۆڤدا بە شێوازێکی روولێنراو قسەی کردووە، پاش وەڵامدانەوەی بەم پرسیارانە، یاسای گشتیی پێویست و یەکلاکەرەوە بۆ موجتەهید دادەنێت.

پێکهاتەی دیاری بۆچوونی ئوصولی شاطبی بریتییە لە:

چەمکی ئامانج، چەمکی گشتی، شێوازی پێکهاتەیی.

شاطبی بە شێوازی داهێنەرانەی خۆی بیری ئوصولی گۆڕی و گرنگیی زۆری دا بە (استقراء) لە مەودای زانستە شەرعییەکاندا بەڵام بەداخەوە کاری ئەو ماوەیەکی زۆر فەرامۆش کرا و تەنانەت بەدەر لە درەختی (مەعقول و مەنقول) هەژمار کرا.[2]

٥–رەوتی دەرهێنانی فەرعەکان لە رووی ئوصولەوە: ڕاجیاوازیی نێوان پێشەوایان یەکێکە لە دیاردە دەستنیشانکراوەکانی مێژووی ئیسلام، راستییەکی حاشاهەڵنەگر و پێشینەدارە، زانایان پاش لێکۆڵینەوەی زۆر لەم بوارەدا گەیشتوونەتە ئەو سەرئەنجامەی کە (ڕاجیاوازی) مەسەلەیەکی بەگۆترەو بێ بەڵگە نییە، بەڵکو بەرهەمێکە لە

١- د. زيدان، الوجيز، ص١٩.

٢- د. محمد عابد الجابري، بنية العقل العربي، ص٥٤٠ـ ٥٤٨.

بەرهەمەکانی بوونی ڕاجیایی لە ئوصولدا. ئەم کارە بووەتە هۆی ئەوەی کە لە باوەشی فیقهدا زانستێك بە ناوی (زانستی ڕاجیایی) گەشە بکات، کە بە تۆمارکردن و دۆزینەوەی ریشەی وتە جیاوازەکانی پێشەوایان و بۆچوونی ڕاجیاوازیی فەقیهەکانەوە خەریکە. ئیمام شافیعی یەکێکە لە پێشڕەوانی ئەم رێگا، کە بۆ ڕاجیاوازەکانی نێوان ئەبو حەنیفە، مالیك ئیبن ئەبی لەیلا و ئەوانی تر، تێڕوانینی هەبووە و خودی ئەو لەم بارەیەوە خەریکی داوەری بووە.

زانستی ڕاجیایی هەر بەو جۆرە لە هەوڵداندا بوو تاکو ئەوەی لە سەدەی پێنجەمی هجری (علامة ابو زيد دبوسي حنفي، متوفى ٤٣٠هـ) پەرتووکێکی سەبارەت بە ڕاجیایی ئەبو حەنیفە و هاوڕێیانی لە لایەك لەگەڵ ئیمام مالیك و ئیمام شافیعیدا، لەلایەکی ترەوە بە ناوی (تأسيس النظر)، نووسی. ئەم پەرتووکە سەرەتای لایەنخوازییەکی نویێ لە ڕاگەیشتن بە مەسەلە ئوصولییەکان، واتا رەوتی (تخریجی فروع لە رووی ئوصولەوە).[1] هەژمار دەکرێت، کارێك کە پاش ئەو (ابن السيد بطليوسی، المتوفى ٥٣١هـ) لە پەرتووکێکدا بەناوی (الانصاف في التنبيه على المعاني والاسباب التي أوجبت الاختلاف بين المسلمين في آرائهم) درێژەی پێدا.

ئەم پەرتووکە هەرچەند تایبەت نییە بە فیقهەوە، بابەتی تری وەك زانستی ئوصولی دین و بیروباوەڕی لەخۆ گرتووە، بەڵام بە بنەمای ڕاجیاوازیی زانایان کە بریتین لە (زمان، ریوایەت، نەسخ، ئیجتیهاد، ئیباحە، تەوسیع) گرنگییەکی زۆر دەدات.[2]

بەڵام گرنگترین ئەو پەرتووکانەی کە ئەم رەوتە دەگەیەنێتە لوتکە، ئەمانەن:

(تخريج الفروع على الاصول)، نووسینی (امام ابو المناقب شهاب الدين زنجاني، المتوفى ٦٥٦هـ) کە لێکۆڵینەوەیەکە سەبارەت بە کاریگەریی ڕاجیاوازیی ئوصولیی نێوان ئەحناف و شافیعی لە ڕاجیاوازییە فیقهییەکاندا.[1]

---

١- د. محمد حسين هيتو، مقدمة تحقيق كتاب التمهيد، ص١١.

٢- ابن السيد البطليوسي، اونصاف في التنبيه على المعاني والاسباب التي أوجبت الاختلاف، ص٣٣.

(تمهيد الوصول الى بناء الفروع على الاصول)، بەرهەمی (امام ابو عبدالله محمد بن احمد مالكی تلمسانی، المتوفى ٧٧١) كە گرنگی بە ڕاجیاوازیی ئوصولی، پاشان فیقهی لە نێوان سێ مەزهەبی حەنەفی ـ مالیكی ـ شافیعیدا، دەدات.[٢]

(التمهيد في تخريج الفروع على الاصول)، دانراوی (جمال الدين اسنوي شافعي، المتوفى ٧٧٣)، كە باس لە ڕاجیاوازی لە نێوان لایەنگراندا، بەتایبەت پەیڕەوانی مەزهەبی شافیعی، دەكات.[٣]

(القواعد والفوائد الأصولية وما يتعلق بها من الأحكام الفرعية). دانراوی (علاء الدين ابن اللحام حنبلي، المتوفى ٨٠٣هـ)، ئەم پەرتووكە زۆربەی كات ڕاجیاوازیی فەقیهەكانی حەنبەلیی بۆ ڕاجیاوازیی ئەوان لە ئوصولدا گەڕاندووەتەوە و نزیكەی ٦١ یاسای ئوصولیی لە ئەودا جێكردووەتەوە.[٤]

(الوصول الى قواعد الاصول)، نووسراوی (محمد بن عبدالله ترمرتاشی حنفی، متوفى ١٠٠٤ هـ)، كە بە گوتەی خودی ئەو، شێوازی ئەسنەویی گرتووەتە پێش.[٥]

(الانصاف في بيان أسباب الاختلاف في الأحكام الفقهية)، ریسالەیەكە لە (شاه ولی الله احمد بن عبدالرحيم دهلوی)، (متوفى ١١٧٦هـ).[٦]

لەم سەردەمەی ئێستادا دەتوانرێت بە چەند بەرهەمی گرانبەها ئاماژە بكرێت:

---

١- شهاب الدين زنجاني، تخريج الفروع على الاصول، تحقيق د. محمد اديب صالح، مؤسسة الرسالة، ١٩٧٩.

٢- التلمساني، مفتاح الوصول الى بناء الفروع على الاصول، تحقيق الشيخ عبدوالوهاب عبداللطيف، القاهرة، ١٩٦٣.

٣ - جمال الدين الاسنوي، التمهيد في تخريج الفروع على الاصول، تحقيق: محمد حسن هيتو، مؤسسة الرسالة، ١٩٨٠.

٤ - ابن اللحام، القواعد والفوائد الاصولية تحقيق محمد حامد الفقى، دار الرياض، ١٩٨٣.

٥ - د. محمد حسن هيتو، مقدمة اسنوي، ص١٢.

٦- د. محمد رمضان الداية، مقدمة الانصاف ابن السيد بطليوسی، ص١٤.

(أثر الاختلاف في القواعد الاصولية في اختلاف الفقهاء)ی (الدكتر مصطفى سعيد الخن) و (أسباب اختلاف الفقهاء)ی (الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي)، ئەم ڕەوتە كەموكووڕییەكانی هەردوو ڕەوتی فەقیهەكان و موتەكەلیمینی لابردووە و ڕۆڵی ڕەهەندییانەی ئوصولی فیقهی لە ئاڕاستەكردنی موجتەهیدیندا بە باشی پیشان دەدات، ئەمە هەمان ڕەوتە كە شاطبی لە (الموافقات)دا لە پێشەكیی چوارەمدا ستایشی دەكات، كە دەڵێت:

(هەر مەسەلەیەك لە مەسەلەكانی ئوصولی فیقه، لەسەر ئەو فروعی فیقهی یاخود دەستووری شەرعی بونیاد نەنرێت، یاخود یارمەتیی ئەم كارە نەدات، بوونی ئەو لە نێو ئوصولدا ناپایەدارە)[1] واتا ئەو بەردەوام مەسەلەیەك لە ئوصولدا بە ڕەسەن دەزانێت كە ببێتە بنەما بۆ مەسەلە فەرعییەكان.

٤- زانستی فەرموودە: (حەدیسناسی) زانستێكە كە بەهۆی ئەوەوە (وتەكان، كردارەكان و ژیانی پێغەمبەر ﷺ دەزانرێت).

بابەتەكە هەروەك باس كراوە ئاشكرایە، بەڵام مەبەست لە فێربوونیان هەروەك لە زۆربەی پەرتووەكاندا هاتووە، گەیشتنە بە بەختەوەریی دونیا و ئاخیرەت، چونكە هەركەس بتوانێت كە (وتە و كردار و هەڵسوكەتەكانی) بزانێت و بیانكاتە سەرمەشقی خۆی، بێگومان لە هەردوو دونیا بەختەوەر دەبێت و دەگات بە ئارەزووی.

ئەم زانستە خۆی دابەش دەبێت بۆ دوو زانست، كە ئەمانەن:

١- زانستی ڕیوایەتكردنی حەدیس: بە چۆنیەتیی پەیوەندیبوونی حەدیسەكە بە پێغەمبەرەوە، واتا بە ناسینی ڕاوییەكان و پیاوانی بواری حەدیسەوە سەرقاڵە و پێی دەوترێت ئوصولی حەدیس.

---

[1] - شاطبی، الموافقات، ج١، ص١٤.

٢ـ زانستی ئاگایی له حەدیس: چاو دەخاتە سەر دەقی حەدیس، چۆنیەتی تێگەیشتنی حەدیس، مەبەستی راستەقینەیی ئەو و هاوڕابوون لەگەڵ ژیانی پێغەمبەردا، یاسای زمان، دەستوور و بنەماکانی شەریعەت.[1]

له (مفتاح السعادة طاش كبرى زادة)دا هاتووه: (هەموو زانستەكانی زمانی عەرەبی و ناسینی ژیان و هەواڵەکانی پەیوەست بە پێغەمبەرەوە، ئاگایی لە ئوصولی دین و ئوصولی فیقه، لە پەیڕەو و پرۆگرامەکانی زانستی حەدیس هەژمار دەکرێن.[2]

له (جامع الاصول)ی (ابن الأثير)دا هاتووه:

(زانستی شەریعەت دابەش بوون وەردەگرێت بۆ (فەرز، سوننەت. فەرز: فەرزی عەین، فەرزی کیفایە) کە دووەمین بەڵگە لە بەڵگەکانی ئەحکامە. ئەم زانستە بنەما و ئەحکام و یاسا و واژەی خۆی هەیە، کە زانایان نووسیویانە و فەقیهەکان راڤەیان کردووە، کەسێك کە خوازیاری زانستی حەدیس بێت، دەبێت بیانزانێت و ئاگایی لێیان هەبێت، هەڵبەت پاش ئاگایی لە زمان و شیتەڵکردن، کە بۆ حەدیسناسی و ئەوانی تر بە ئەساس هەژمار دەکرێت.[3]

له مەودای زانستی حەدیسدا هەر ریوایەتێك لە بەرامبەر توێژینەوە و رەخنەدا قەرار دەگرێت. مرۆڤ دەبێت لە دانانی زاراوە و دەقی حەدیس لە زمانی پێغەمبەرەوە دڵنیا بێت، چونکە حەدیس سەرچاوەی یارمەتیدەری قورئانە لە بواری فەقاهەتدا.

٥ـ ژیانی پێغەمبەر (سیرة) و مێژووی ئیسلام: زۆربەی دەقە پیرۆزەکان، لەناو کۆی مێژوودا واتا وەردەگرن. بەبێ گەڕانەوە بۆ ژیانی پێغەمبەر ﷺ جێبەجێ کردنی ئەوانە لە داکەوتەدا کارێکی دژوارە، چونکە زۆرجار مرۆڤ لە چەسپاندن و رەفتار پێکردنیاندا لەوانەیە بکەوێتە هەڵەوە.

---

[1] - حاجی خليفة، كشف الظنون، ج١، ص٦٣٥.

[2] - طاش كبرى زادة، مفتاح السعادة، ج٢، ص١١٣.

[3] - ابن الأثير، جامع الاصول، ج١، ص٢٧ـ ٢٨.

لەبەرئەوە خوێندنەوەی دەق وا دەخوازێت کە خوێنەر قۆناغەکانی (مەککی ـ مەدەنی) و پێگەکانی بانگەواز پێگەیاندن، جیهاد، شۆڕش و حکومەتی پێغەمبەری ﷺ بە باشی دەرك کردبێت. جگە لەم شێوازە، بە باشی ناتوانێت خوێندنەوە بۆ دەقەکان بکات و ئەنجامی واتاکانی هەڵبگۆزێت.

٦ـ بیرکردنەوە و رۆچوونی پێویست: جگە لە ئامرازە باسکراوەکان، خوێندنەوەی دەق پێویستی بە هزرێکی بیرکەرەوە، وردبین، پێگەناس هەیە، ئەوەی کە قورئانی پیرۆز بە (تدّبر) باسی دەکات (أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا) (محمد: ٢٤) کەوایە هەرچەند بیرکردنەوە قووڵتر و وردبینانەتر بێت، دونیای دەق بۆ وەرگر زۆرتر و باشتر کراوەیە.

ریوایەت کراوە کە کەسێك لە ئیمام عەلیی پرسی:

ئایا پێغەمبەر ﷺ ئێوەی بە شتێك جگە لە قورئان تایبەتمەند کردووە؟

ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: نەخێر، جگە لە تێگەیشتن و بیرکردنەوەیەك کە خودا بەخشیویەتی بە مرۆڤ.[1]

چۆنیەتی بیرکردنەوەیە کە موفەسیرێك لەوانی تر جیا دەکاتەوە و بەهۆی ئەمەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێت دەقەکان پێکەوە پەیوەست بکات و بچەسپێنێت، بەتایبەت کە گوتوویانە قورئان خۆی تەفسیری خۆی دەکات و سوننەت خەریکی روونکردنەوەی قورئان دەبێت.[2]

لەم بوارەدا ژمارەیەکی باش تەفسیرکراون کە پشتیان بە قورئان و ریوایەتە صەحیحەکان بەستووە، بۆ نموونە (جامع البيان)ی ئیبن جەریر تەبەری و (تفسير القرآن العظيم)ی ئیبن کەسیری دیمەشقی.

ب ـ ئەو ئامرازانەی کە واتای ـ دەقەکان ـ دەڕوشێنن و تێکەڵی دەکەن.

---

[1] - احمد بن حنبل، المسند، ج١، ص٧٩. لە بوخاریشدا هاتووە.

[2] - د. يوسف القرضاوي، المرجعية الاسلامية العليا للكتاب والسنة، ص٤٤.

زانایانی ئەهلی بەیان بەردەوام پەیڕەوانی خۆیان لەو ئامرازە نادڵنیا و ناکردارییانە بەدوور گرتووە کە سوودوەرگرتن لێیان موفەسیر و خوێنەر لەڕێ بەدەر دەکەن، لەوانە:

١ـ ریوایەتی هەڵبەستراو: واتا ئەو وتە و قسانەی کە دەستەیەك کەسی کینە لە دڵ و درۆزن بە ناونیشانی حەدیس و بە مەبەستی تێکدانی بیر و ڕەواجدان بە خورافات و بیروباوەڕی پوچەڵ، دایان ناوە.

هەڵبەت فەرموودەناسان لە بەرامبەر ئەم کارانەدا بێدەنگ و کەمتەرخەم دانەنیشتوون و کۆمەڵێك بنەما و یاسایان بۆ دیاریکردنی ساختەکان (الموضوعات) خستووەتە خزمەت زانایانەوە کە لەبەرچاوگرتنی ئەوانە بە دەستەبەری پاکیی حەدیسەکانی پێغەمبەر هەژمار دەکرێت، بەتایبەت (ابن الجوزي) لە (الموضوعات) دا، (سیوطي) لە (اللآلي المصنوعة)دا، (ملا علی القاري الحنفي) لە (المصنوع)دا و (شوکانی) لە (الفوائد المجموعة) خزمەتی شایانیان لەم لایەنەدا ئەنجام داوە.

(ابن القیم) لە بەرهەمێکی کورت، بەڵام گرانبەهادا (المنار المنیف)، یاسا و دەستوورێکی گرنگ دەخاتە خزمەت خوێندکارانی بواری فەرموودەناسی، کە بە گشتی خوازراوی هزرێکی تەندروست و بیرکەرەوەیە.

٢ـ ئیسرائیلیات: هەروەها موفەسیر ئەرکی لەسەرە لە کاری تەفسیر و خوێندنەوەی دەقی دینیدا، ئاگای لە (چیرۆکەکان، ئاڕاستەکان، لێکدانەوەکان کە وەرگیراوی ڕاوی یان ئەوانەی کە سەرچاوەکانی ئیسرائیلی بێت، کە لە نەریتی زانا موسڵمانەکاندا ناوی (ئیسرائیلیاتە)، کە دەستانێك پیشەیان خیانەتە بە مەبەستی شێواندن و تەزویرکردنی هزر و کلتووری ئیسلامی گەیاندوویانە، لە قۆناغە دواییینەکاندا کەسانی نەزان و هەڵخەڵەتاو دەم بە دەم گواستوویانەتەوە تا ئەو جێگەی کە بە ناونیشانی راستێتی و کارێکی حەتمیی لێهاتووە، هەرچەندە هەموو ئەمانە لە بنەرەتدا هیچ بایەخێکیان نییە و جگە لە خەیاڵ شتێکی تر نین. کەوایە دەبێت خوێندنەوەی دەق پاك بێت لە هەر جۆرە بیر و ریوایاتێکی ئیسرائیلی. چونکە بنەمای پەیوەندیی کلتوور و ژیارەکان وەها پێویست دەکات کە اقتباس (وەرگرتن)ی واژەکان و بیر و تەنانەت شێوازەکان، لەسەر بنەمای بەدواداچوون و پاراستنی شووناسی خودی بێت.

٣ـ جگە لە هەڵبەستراوەکان و ئیسرائیلیات: هەندێك واژە و چیرۆك بەناوی هاوەڵان و تابیعینەوە تەزویر کراون کە دەبێت موفەسیر بەدوور بێت لێیان.

٤ـ لە قوتابخانەی ئەهلی بەیان (روونکردنەوە) تەفسیر بە بۆچوون: واتا خوێندنەوەی دەق بەبێ پشتبەستن بە بەڵگەی (عیلمی، عەقڵی، نەقڵی)، بەڵکو لەسەر بنەمای حەز و ئارەزووی کەسی، زۆر سەرزەنشت کراوە، چونکە جگە لەوەی لادانە لە رێگەی سەلەف و رێگای راست، ئەنجامی خراپی بەدواوەیە، لەوانەیە بۆچوونی وەها بدرێت بەسەر دەقەکاندا کە پێچەوانەی بنەما و دەستووراتی یەکلاکەرەوەی ئیسلام بێت.

علامة ابن القیم لە (اعلام الموقعین) پانتاییەکی فراوانی بە مەسەلەی ـ بۆچوون ـ تایبەت کردووە و پاش هێنانی چەند نموونە لە وتەی پێشڕەوانی ئیسلام تایبەت بە (رەئی ـ بۆچوون) دابەشی دەکات بۆ سێ جۆر: باطل، راست، موشتەبەه.

١ـ بۆچوونی باطلیان رەتکردووەتەوە و سەرزەنشتیان کردووە.

٢ـ بۆچوونی راستیان بەکارهێناوە و حوکمیان پێ کردووە.

٣ـ بۆچوونی موشتەبەهیان تەنها لە کاتی پێویستدا بە رەوا زانیوە، هەرچەند ئەم جۆرە بۆچوونەیان بە ناچاری سەپاندووە، بەڵام دژایەتی کردن لەگەڵیدا بە دژایەتیکردنی دینیان هەژمار نەکردووە.

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: دەربارەی قیاس لە شافیعی پرسیارم کرد، لەوەڵامدا فەرمووی بە من: (لەکاتی پێویستدا کاری پێ بکرێت).[1]

ئەم زانا گەورەیە کە بە هەر جۆرێك بە داکۆکیکار لە بونیادەکانی قوتابخانەی سەلەفیەت هەژمار دەکرێت، لە درێژەپێداندا بۆ ئاوەز هێڵی سوور دەکێشێت، کە نابێت لێی تێپەڕێت. واتا ئاوەز تەنها لە چوارچێوەی (نقل ـ گێڕانەوە)دا مۆڵەت پێدراوە کە بجووڵێت، لە هەر شێوازێکدا کە لە بازنەی نەقڵ تێپەڕێت، ئەم هەڕەشەیە دەیگرێتەوە کە پێغەمبەری

---

[1] - ابن القیم، أعلام الموقعین، ج١، ص٥٣ـ ٥٨.

خودا دەفەرموێت: (تفترق أمتي على بضع وسبعين فرقة أعظمها فتنة قوم يقيسون الدين برأيهم يحرمون ما أحل الله ويحلون ما حرم الله).[1]

واتە: ئوممەتی من بۆ حەفتاو چەند گرووپێك دابەش دەبن، لە هەموویان فیتنەگێڕتر کەسانێکن کە دین بە بۆچوونی خۆیان بەراورد دەکەن، حەڵاڵی خوا حەرام دەکەن و حەرامی خوا حەڵاڵ دەکەن). لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێت: (من قال في القرآن بغير علم فليتبوأ مقعده من النار).[2] واتە: هەرکەس سەبارەت بە قورئان بەبێ زانست قسە بکات، دەبێت جێگای خۆی لە دۆزەخدا خۆش بکات.

شایانی باسکردنە لە نێوان زانایانی ئەهلی روونکردنەوە (بیان) دا ئەوانەی کە ویستوویانە لە فەلسەفە و کەلامدا بەشداری بکەن، لە نێو پابەندبوون بە دەقەکانی قورئان و سوننەت، تا ئەندازەیەکی زۆرتر لایەنگیرییان بۆ ئاوەزگەرایی هەبووە و باوەڕیان وەهابووە کە هزری روون و گواستنەوەی راست، پێکەوە پەیوەستن و یەکتر دەسەلمێنن. لەلایەکی ترەوە راستەقینەیی (نقل) بە بەڵگەیی بوونی ئاوەز دەسەلمێت، لەلایەکی ترەوە دیدی ئاوەز بەرێنموونی (نقل) روون دەبێتەوە، بە گوتەی ئەبو حامیدی غەزالی:

ئاوەز تەنها بە هۆی شەرعەوە رێگا پەیدا دەکات، شەرعیش تەنها بە ئاوەز رووناك دەبێتەوە. لەبەرئەوە ئاوەز وەك بونیادی خانووە و شەرعیش وەك خانووە، نە بونیاد بەبێ خانوو سوودێکی تێدایە و نە خانوو بەبێ بونیاد پایەدار دەمێنێتەوە.[3]

بەدرێژایی مێژووی ئیسلام (عەقڵ و نەقڵ) و پەیوەندیی نێوانیان لە دەستەی بابەتە گەرموگوڕەکانی مەیدان بوون، کە کێشەیان دروست کردووە، لەم نێوەندەدا سێ رەوتی جیاواز هاتوونەتە مەیدانی دەرکەوتنەوە:

---

[1] - ئەم حەدیسەم بەم صیغەیە تەنها لای ابن القیم دەستکەوتووە.

[2] - المناوي، فيض القدير، ج٦، ص١٩٠.

[3] - امام غزالي، معارج القدس في مدارج معرفة النفس، ص٥٧.

١ـ ڕەوتی کەسانێك کە تەنها لە سنووری پەیڕەوی لە نەقلْ بە عەقلْ مۆڵەتی بوونیان داوە، بیٚ ئاگا لەوەی کە ئەساسی بونیادی نەقلْ کە هەمان تەوحید و نبووەتە، بە بەڵگەی ئاوەز و بیرکردنەوەی ئاوەزی لە ئاسۆ و دەروونەکاندا دەسەلمێت.

ئەوان وای بۆچوون کە پشتبەستن بە ئاوەز ڕێگا بۆ هەوەس و حەزەکانی نەفس هەموار دەکات و واتای دەقە پیرۆزەکان دەباتە ژێر پرسیارەوە.

ئەم ڕەوتە بەشێوەیەکی تەواو و پڕاوپڕ لە مێژووی ئیسلامدا بە (حشوية) ناوی هەیە، کە ئایەتەکانی خوایان بەپێی زاراوەکان، بەبیٚ بیرکردنەوە و بەکارهێنانی ئاوەز، بە جێبەجێکراویان دادەنا و بەمشێوەیە ڕوویان کردە تجسیم (واتا خودا جەستەیە) بە لێکچوواندن (تشبیە)[1].

ئەمڕۆ بە سەرنجدان لە بابەتی نووسراوی هەندێك لە نووسەرانی سەردەم، پاشماوەیان هەیە کە داوای پەیڕەوکردنی سەلەف دەکەن و وەك ڕێگرێك لەسەر ڕێگای هزرمەندی جوڵانەوەی موسڵمانان هەژمار دەکرێت، چونکە هەر جۆرە داهێنان و نوێخوازییەك بە بیدعە دەزانن و ڕەتیدەکەنەوە، لەکاتێکدا سەلەف وەها نەبوون، چەمکی بیدعە هەم ئەوەندە فراوان نییە کە گشت مەسەلە نوێیەکان لە خۆیدا جێگا بکاتەوە.

٢ـ ڕەوتی عەدلیە (معتزلة و هاوڕاکانیان) بڕوایان وەها بوو (بە تەریبی شەریعەتی وەحی/ شەریعەتێکی عەقڵی هەیە) بە جۆرێك کە مەودای ئەو کەمتر لە مەودای نەقلْ نییە و نابێت. ئەمڕۆ هەرچەند گرووپی موعتەزیلە بوونی نییە، بەڵام لە بۆچووندا لەگەڵ شیعەی ئیمامیە و زەیدییە هاوڕایی هزری و کلتوورییان هەیە. ئاوەزاگەرایی شیعە بە نیشانەیەك لە ڕەوتی موعتەزیلە هەژمار دەکەین، لەگەڵ سەربەخۆیی تەواوی ئەم دوو گرووپە لە یەکتر، چونکە ڕەوتی شیعە لایەنگیرییەکی عەقڵییە بەتایبەت لە هەردوو بواری (کەلام، ئوصول فیقه)دا.

---

[1] - التهانوي، كشاف اصطلاحات الفنون والعلوم، ج١، ص٦٧٨ـ ٦٧٩.

هەروەها دەتوانرێت رووداوی گەڕانەوە بۆ ئاوەزگەرایی موعتەزیلە، کە ئەمڕۆ لە نێوان رۆشنبیرانی نەوەی نوێ کەوتووەتە خۆ، بە جۆرێك لە رەوتی موعتەزیلە هەژمار بکرێت، کە مەبەستی ئەوان دووبارە هێنانەوەی رۆڵی ئاوەزە بۆ نێو هزری ئیسلامی.

٣ـ رەوتی میانە (ناوەند): ئەوانەی کە ویستوویانە جۆرێك هاوڕایی و هەماهەنگی لە نێوان (عەقڵ ـ نەقڵ) دا دروست بکەن، وەك ئەوەی پەراوێزی نەقڵ وەها دیاری بکەن کە جێگای رەزامەندی و ستایشی هزر بێت و پەیوەندیی پێویست و لێکدانەبڕاوی ئەو دوانە لە گۆڕەپانی خوداناسی و ئەخلاق و سیاسەتدا پیشان بدەن. ئاشتەوایی نێوان (عەقڵ، نەقڵ) و هاوڕایی ئەم دوانە لە نووسینەکانی (غەزالی، ئیبن حەزم، ئیبن روشد، ئیبن تەیمیە) هەڵبەتە بە رێژەی جیاواز، دەبینین.

غەزالی، (إحیاء علوم الدین) تۆمار دەکات، ابن حزم، (تقلید) حەرام دەکات، ابن رشد، حیکمەت و شەریعەت پێکەوە و پەیوەست بە یەك راستی دەزانێت، هەر بەو جۆرەی کە ئیبن تەیمیە دژبوون لە نێوان (عەقڵ، نەقڵ)دا ڕواڵەتی و بە چارەسەرکراو دادەنێت.

فیقهی ئیسلامی بە درێژایی مێژووی خۆی گۆڕانی زۆری بەخۆوە دیوە و بەردەوام رێگای خۆی هەماهەنگ لەگەڵ کۆمەڵگا بە ئاراستەی پێشکەوتن و کامڵبوون، کردووەتەوە.

فیقه لەبەر رۆشنایی نوێبوونەوە و گۆڕاندا سوودی زۆری وەرگرتووە، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە بەردەوام هەنگاوێك لە پێش کۆمەڵگاوە بووە، یان باشتر بڵێین، فیقهی ئیسلامی لە گرەوی بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگادا لاگیری دەکات.

بازهەڵدان و پەڕینەوە لە (فقهي محدثین، فقهي روائي، منقول، فیقهی مجتهدین: فیقهی ئیستنبات و معقول، لەوەوە بۆ فیقهی تفریع و تخریج و سەرئەنجامی سەدان نقل و ئیستنبات و شرح و تحشیة) هیچ لێکدانەوە و تەفسیرێکی نییە جگە لەوە بڵێین زانستی فیقه وەکو هەر دیاردەیەکی تر، بەردەوام لە حاڵی بەرەوپێشچوون و گۆڕانکاریدا بووە و هەیە و دەشبێت، ئەم گۆڕانە بەبێ بەڵگە و لەخۆوە رووی نەداوە.

سەید قوتب لە (في ظلال القرآن)دا بۆچوونێکی زۆر درێژی هەیە، کە دەڵێت:

(فیقهی ئیسلامی له بۆشاییدا دروست نه‌بووه و له بۆشاییدا شیاوی جێبه‌جێ کردن و شیاوی تێگه‌یشتن نییه).[1]

ئه‌م وته‌یه روونکه‌ره‌وه‌ی دیدگای رۆشنبیرانی سه‌رده‌مییانه‌ی ئیسلامگه‌رایه له دونیای ئه‌مڕۆدا، که هه‌وڵی په‌یوه‌ستکردنی (فیقه و ژیان، شه‌ریعه‌ت و کۆمه‌ڵگا) ده‌ده‌ن و هه‌ر جۆره لێکپچڕاندنێك له نێوانیاندا، به کێشه ده‌زانن، چونکه په‌یوه‌ندیی فیقه له‌گه‌ڵ ژیاندا په‌یوه‌ندییه‌کی چاره‌نووسسازه و فیقه به‌بێ ژیان ده‌بێته شتێکی بۆماوه، که زانینی ته‌نها لایه‌نی مێژوویی و سه‌رگه‌رمبوون ده‌هێنێت و ژیان به‌بێ فیقه، ژیانی موسڵمانان به‌بێ رۆح و به‌بێ ده‌ستکه‌وتی بیروباوه‌ڕ ده‌هێڵێته‌وه.

له‌م لایه‌نه‌وه‌یه که له قۆناغه‌کانی مێژوودا به‌رده‌وام که‌سانێك هه‌بوون که به احیاگری revival (زیندووکردنه‌وه) یا چاکسازی (reform) یاخود به گوته‌ی ئیقبالی لاهوری، بونیادنانه‌وه‌ی (reconstuction) دین یان تێگه‌یشتنی دینییه‌وه سه‌رقاڵ بوون، چونکه ئه‌وانه چاکسازیی کۆمه‌ڵگای ئیسلامی په‌یوه‌ست به چاکسازی له تێگه‌یشتنی بنه‌ماکانی شه‌ریعه‌ت و چۆنیه‌تی وه‌رگرتنی بۆچوونه‌کان له ده‌قه‌کان و نووسراوه دینییه‌کان ده‌زانن.

ئه‌وان بۆ لابردنی که‌می و ناڕێکییه‌کانی کۆمه‌ڵگا سه‌ره‌تا باسیان له پێویستیی چاکسازی له دینداریی خه‌ڵکیدا کردووه و ئاشکرایه که دینداری کاتێك چاکسازیی تێدا ده‌کرێت که تێگه‌یشتنی خه‌ڵکی له دین تێگه‌یشتنێکی ڕاست و دروست بێت، چونکه هه‌موو خه‌ڵکی ناتوانن له بابه‌ته تایبه‌تییه دینییه‌کاندا خاوه‌ن بۆچوون بن، وه‌ك پێویست ده‌بێت که‌سانێك له‌م رێگایه‌دا پێشڕه‌وانه به‌ره‌وپێش برۆن و خه‌ڵکی ئاگادار بکه‌نه‌وه له دین و شه‌ریعه‌ت، که‌وایه به‌ره‌وپێشچوونی چاکسازیی دینی سێ پایه‌ی بنه‌ڕه‌تیی هه‌یه:

١ـ تێگه‌یشتن و بۆچوونی نوێ له ده‌قه دینییه‌کاندا.

٢ـ کۆمه‌ڵگا له حاڵی گۆڕاندا بێت.

٣ـ موجته‌هیدانی نوێبیر و نوێخواز.

---

[1] - سيد قطب، في ظلال القرآن، ج٤، ص٢٠٠٦.

# ئەنجامگیریی

بە سەرنجدان لەو بابەتانەی کە لەم باسەدا نووسراون، کۆمەڵێك ئەنجاممان بەدەست هێناوە کە لە خوارەوە ئاماژەیان پێ دەدەین:

١ـ فیقه زانستێکە لە سەدا سەد ئیسلامی، کە لە سەرەتادا بە واتای ئاییناسی و بە تێپەڕینی کات هاومانا لەگەڵ زانستی شەرعیی کرداری بەکارهاتووە.

٢ـ یەکێك لە دیارترین نیشانە و تایبەتمەندییەکانی زانستی فیقه، نوێبوونەوە و گۆڕانە بەپێی خواستی گۆڕان و نوێبوونەوە لە ژیانی تاکی و کۆمەڵایەتیی مرۆڤەکاندا.

٣ـ هەموو پێکهاتەکانی دروستکەری فیقه، جگە لە قورئان و سوننەت، کە ماهیەتی سەرو مێژووییان هەیە، لە راستییدا دەکەوێتە بەر دیدی گۆڕان و بەرەوپێشچوون، ئەم پێکهاتەیە گۆڕاو و چالاکە بریتییە لە:

دەستەواژە و چەمکەکان، سەرچاوەکان، زمان و شێوازی نووسین، ئەرك و رۆڵ، پەیوەندی لەگەڵ زانستەکانی تردا، لە کۆتاییدا تەفسیری دەقە دینییەکان.

٤ـ ئێمە نوێبوونەوەی فیقه لە شرۆڤەی پێکهاتە و بنەماکانی نێو پێناسەی فیقهەوە تێدەگەین. تەنانەت ئەگەر لە راستیی مێژوویی فەقاهەت و ئیجتیهاد بە درێژایی ساڵە یەك لەدوای یەکەکان چاو دابخەین، چونکە بە بۆچوونی ئێمە نوێبوونەوە یەکێکە لە پێویستییە خودییەکانی فیقه لە هەلومەرجە ئاسایی و ئایدیالەکاندا، بەڵام دەشکرێ بۆ ئەم تیۆرییە لە مێژووی فیقه چەند نموونەیەك بە ناونیشانی شایەدی زیندوو وەربگرین.

# ناوەرۆك


پێشەكی ........................................................ ٥

چەمكی فیقھ ..................................................... ٧

فیقھ لە زمانەوانیدا ................................................ ٧

چەمكی فیقھ لە سەرەتادا ........................................... ٨

واتای فیقھ لە تێڕوانینی زانایانی زانستی ئوصولدا ........................ ٨

واتای فیقھ لای فەقیهەكان .......................................... ١١

تایبەتمەندییەكانی فیقھ ............................................. ١٢

نوێبوونەوەی فیقھ .................................................. ٣١

نوێبوونەوە لە پێناسە و ماهیەتی فیقهدا ................................ ٣٤

نوێبوونەوە لە دەستەواژە فیقهییەكاندا ................................. ٣٧

نوێبوونەوە لە سەرچاوەكانی فیقهدا ..................................... ٤٠

نوێبوونەوە لە بابەتەكانی فیقهدا ...................................... ٤٥

نوێبوونەوەی لە ئاینزا فیقهییەكاندا .................................... ٦٥

نوێبوونەوە لە زمان و شێوازی نووسیندا ................................ ٧٠

نوێبوونەوە لە ئەركەكاندا ............................................ ٧٥

نوێبوونەوە بە پەیوەندی لەگەڵ زانستە نوێیەكاندا ........................ ٧٩

نوێبوونەوە لە تەفسیری دەقە دینییەكاندا ............................... ٨٤

ئەنجامگیریی ...................................................... ١١٠

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی




دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکری و رۆشنبیری و ژیاری بۆ ئوممەی ئیسلامی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامی.

– چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاڕاستەکردنی کاروانی ژیاریی مرۆڤایەتی و بەرچاوڕۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە، هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر، لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

– هاوکاریی هەوڵ و کۆششی زانا توێژەرەوەکانی زانکۆ و بنکەکانی توێژینەوەی زانستی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

– ئاڕاستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لەپێناو خزمەتکردن بە فیکر و مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لە ڕێگەیانەوە کار و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبی و ئیسلامی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستیی هاوبەش، هەیە.

# سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری




سەنتەرێکی کوردستانیی ناحکومیی ناسیاسییە، گرنگی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان، بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا، لە سۆنگەی ئەوەوە کە هزر و بیری ڕەسەن و قووڵ بنچینەی تێگەیشتنی ڕاست و دروستە بۆ دەقەکانی قورئان و سوننەت و دەستەبەری لێکدانەوەی گونجاوە بۆیان. سەنتەر هەوڵی ڕەخساندنی کەشوهەوای گونجاو دەدات بۆ کارابوونی عەقڵ و بیر و ڕانانی هزری. لەم پێناوەدا سەنتەر هەردوو سەرچاوەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی بەرز و بەڕێز بە بەکارهێنانی ئامرازی زانستە ئیسلامییەکان و زانستە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان، دەکاتە بنەمای کارەکانی.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

- بووژاندنەوەی بیر و هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکۆیی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمییانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.

- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.

ـ کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.

ـ پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.

- سەنتەر کار دەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

**بوارەکانی کارکردن:**

- نووسین بە قەڵەمی خۆماڵیی نووسەرانی کورد و بیرمەندان.

- وەرگێڕان لە زمانە جیاوازەکانەوە بۆ زمانی کوردی لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کلتووری کوردی.

- بەستنی کۆڕ و سازدانی سیمینار لەلایەن خاوەن بیر و ئەکادیمییانەوە.

- خولی ڕاهێنان و وۆرکشۆپ لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی زانکۆییەوە.

ـ هاوکاریکردنی دامودەزگا و دامەزراوە ئەکادیمییەکان و زانکۆکان لە پێناو پەرەپێدانی ئاستی زانستی.